حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣١٤)



# دیوانی مەزلوم

سەید ئەحمەدی شێخ محەمەدی بەنا بەرزنجەیی

ئامادەکردن و پێداچوونەوەو پێشەکی

ئومێد کاکەڕەش

چاپی یەکەم — ٢٠٠٥

دیوانی مەزلوم

ناوی نووسەر: سەید ئەحمەدی شێخ محەمەدی بەنا بەرزنجەیی
بابەت: شیعر
ئامادەکردنی: ئومێد کاکەڕەش
چاپی یەکەم: سلێمانی – ٢٠٠٥
کۆمپیوتەرو دیزاین: مەهدی ئەحمەد
چاپ: چاپخانەی کارۆ
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردنی (١٢٥)ی ساڵی (٢٠٠٥)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

www.roshnbiri . org

# پێشەکی

(مەزڵوم)ی شاعیر یەکێکە لەو شاعیرانە کە لە تەمەنێکی زوودا ماڵئاوایی لێکردین و لەگەڵ چاولێکنانیدا دیوانەکەی پێچرایەوەو دەنگ و رەنگی نەما[1].

دەتوانین بڵێین ئەم شاعیرەمان شاعیرێکی کوردپەروەرو نیشتمانپەرست بووە، خۆشی و بەختەوەریی نەتەوەکەی بەلاوە زۆر گرنگ بووە، ئاوات و خواستی ئازادی و رزگاریی گەل و خاکەکەی بووە لە دەست ئیمپریالیزم و زۆردار:

رەبی، مووسایەك بنێرە قەومی كورد گشت یەك بخا
یا دەلیلێ تۆ عەتاكە، بۆ كوردە هەژارەكەت
خۆ رەزامەندین ئیلاهی، دەربچێ با رۆح و جان
با نەمێنین و رزگار بین گشت لە دەست رۆژگارەكەت

بێگومان چاوکردنەوەی رۆڵەکانی گەل و هوشیارکردنەوەیان بەهۆی زانست و زانیارییە تا لە کاروانی گەلان دوا نەکەون و بە هیواو ئاواتی خۆیان بگەن، لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا هانای بۆ لای خوێندن بردووە کە چەکی گۆڕانکاریی سەردەمە و هەموو ئاوات و نیازێك دەهێنێتە دی:

خەوی غەفڵەت تا بەكەی وا نۆبەتی هۆشیارییە
نۆبەتی عیلم و فنون و نۆبەیی بێدارییە
لەم زەمانە دەردی جاهیل، هەر بە دانا كارییە
دەردی جاهیل بێ دەواو سەعب و سەخت و سارییە

تەنانەت هەر لەو روانگەیەوە ئاوڕێك لە ئافرەتان دەداتەوەو دەیەوێت ئەو نەریتە کۆنە لە ناودا نەهێڵێت کە بواریان نەدەدا بە کچان بخوێنن و ئەم لە کچەکەی خۆیەوە دەست پێدەکات:

من كچە كوردێكم هوشیار
پوختەو خاوێن و نازدار

---

[1] کاك فریدون کریم قادر باسێکی لەسەر شاعیر نووسیوە لە گۆڤاری بەیان، ژمارە ١٤٦، ئاب، ١٩٨٨.

ئەچـــمە مەکتـــەب ئـــەخوێنم
رەگـــی نـــەزان دەردێـــنم
کـــە خوێنـــدنم کـــرد تـــەواو
ئـــەبم بـــە کچـــێکی ناســـراو

پاشان جوانیو دیمەنی خاکی کوردستانی رەنگین بۆتـە هـەوێنی هۆنراوەکانیو بە کامێرای هەستبزوێنی دیمەن بە دیمەنی ئەو کەژو کێوو کۆسارانەی گرتـووە کـە مرۆڤ ناتوانێ چاویان لێبتروکێنێو بۆ ساتێ بەجێیان بهێڵێ:

تۆزی خاکی کوردستانە، سورمەیە بـۆ چـاوی کـورد
وردە بەردت چەشنی گەوهەر، پووشـەکانت یاسـەمین
ئـاوی سـافی چـەشمەکانو شـەوقی بـەفری کێوەکـان
هارەهـاڕی نـەهرەکانت، میسـلی فیردەوسـی بـەرین
هەر زەمانێ تۆ کە پۆشیت بـەرگی سـەوزی نەوبـەهار
دێنـە سـەیرانت بـە جـارێ، چـەند جـوانی نـازەنین

(شێخ سەلام)ی شاعیر لەگەڵ شاخی (ملەکەوە) کەوتـە گفتوگۆ بـۆ هەڵڕشـتنی ئەو داخو ناسۆرەی کە لە دڵیدا پەنگی خواردبوو لە داخی ناکۆکیو ناتەبایی قـەومی کورد، (مـەزلوم) بـە هـەمان هەسـتو سۆزەوە روو دەکاتـە چیای (کورەکاژاو)و بـەو هەنسکو داخەوە بەسەرهاتی رووخاندنی کۆماری کوردستانی لێدەپرسێت:

ئێســتاکە بۆچــی، مــاتو شــێواوی؟
بۆچی حـەزینو زەرد هەڵگـەڕاوی؟

☆ ☆ ☆

وەقتێ کە بیستم رۆژی رەشـی کـورد
هاتمــە جــەمبوش هــەتا شــەقم بــرد
کــردم بــە ســەرما خــاکی بــێ شمــار
یەخـەی خـۆم دڕی لــە ســەرتابەخوار

شاعیر لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا ژیاوەو ژیانی گولەمەرگی بەسەر بردووە، هانای بۆ (کەرە)کەی بردووە کە پێش ئەم زۆر شاعیر باسیان کردووەو ژیانی رۆژانەیان لەگەڵدا بەسەر بردووە بۆ بژێوی ژیانیان، ئەوەتە بە کەرەکەی دەڵێت:

مایەی نۆماڵیم کەرێکی دێز بوو
چاپوكو وریا گەلێ بەهێز بوو
هەر بەناو کەر بوو رێگەو رەفتار خۆش
عەقڵی زیاتر بوو لە بەعزێ بێهۆش

ئەو داخو ناسۆرەی ژیانی دەگەرێتەوە بۆ دنیاو چەرخی سەردەمەکەی کە زۆربەی شاعیران هاواریان لە دەست کردووەو نارەزاییان دەربریووە بەرامبەر بەو ژیانە کە تێیدان، ئەم شاعیرەشمان لەو هەستە پەنگخواردووە روو دەکاتە چەرخی چەپگەردی گەردوونو دەڵێت:

ئاگرت تێچێ جیهان، رەببی گەردنت شکێ بۆ کردەوەت
تۆی مەنبەعی فیسقو فەساد، تۆی ئالەتی زوڵمو قەتڵ
شاخی بەرزت رەببی دەربێ، بە دەم سزاو نەگبەتەوە
تەختو بەختت سەرنگون بێ، تا قیامەت بی خەجەڵ

رەنگە (خەوبینین بە شەیتانەوە) بۆ تامو چێژی کارە سێکسییەکە بێتو زۆر شاعیری پێش ئەم خەومیان دیوەو مەبەستەکەیان پێکاوە.. خەوی شاعیر جیهانی تۆڵەسەندنەوەیەو ئاواتەخوازە هەموو شەوێ شەیتان بێتە خەوی:

یاخوا سەد خێری وەها بێتە رێم
کە دوژمنی خۆم هەر بۆ خۆم بیگێم
ئەلحەمدولیلا لە رۆژی مەیدان
چەند زەربەی کاریم بە دوژمن گەیان

ئەگەر شەیتان خۆی کردبێت بەو کچە شۆخو شەنگەو لە ژوانی شاعیردا شەوی بەسەر بردبێت، رۆژانە چەندەها کیژی چاومەستو گۆنا بێگەرد بە بەردەمیدا گوزەر دەکەنو دڵە شەیداکەی شاعیر دەخەنە جۆشو بەهرەی هۆنراوەی پێدەبەخشن:

ئــەزانم نــەرمو نــازكو تــەڕی
بە خشڵی جوانی پۆشـتەو بەفـەڕی
ڕەنگینی دەڵێـی گوڵـە شەسـتپەڕی
پێم ناڵێی بۆچی لیمـان بـە شـەڕی
یا جوابـێ بـدە یـان چـاو هەڵهێنـە

ئەگەرچی زۆربەی هۆنراوەكانی لەسـەر ڕێبازی هۆنراوەی كلاسیكەو ئاوێتـەی كردەوە بە هۆنراوەی سەردەمەكەی كە شاعیران (قانعو سەلام) پـەیڕەویان كـردووە، بە وشەی نوێ هەستە پەنگخواردووەكەی نێـو دڵو دەروونـی دەربڕیـوەو خـەڵكی بـە سانایی لە هۆنراوەكانی دەگەن، بەكارهێنانی هەندێ وشەی گرانو عەرەبی تـەنها بـۆ سەلیقە شیعرییەكەی دەگەڕێتەوە كە لـەو سـەردەمەدا بـاو بـووەو ئـەم نەیویستووە خـۆی لـێ لابـدا. كـە توانـای بـەدەری زاڵبـووەو جێگـۆڕكێی بـەو وشـانە كـردووە كـە ئەمەش بەهرەی شاعیر زیـاتر دەردەخات، بەداخـەوە تەمـەنی كـورتی شـاعیر بـواری نەدا كە بەرهەمی زۆری ئـەو ڕازە پەنهانـەی دڵیمـان بـۆ ئاشكرا بكاتو باشتر خـۆی لەگەڵ بەرهەمە نوێكاندا بگونجێنێت:

گەرچـی مــن عاسـیو خەجاڵــەت بـارم
ڕوو زەردو مــەحجوب زۆر شــەرمەزارم
لــە مـوڵكی تـۆدام هــەر لــەوێ ئـەمرم
بــە ڕووی ڕەشـــەوە دیوانـــت ئــەگرم
خوایـە بـە جـاهی شـاهی بـوراق سـوار
خۆشبە لـە جـورمی (مـەزلۆم)ی هـەژار

**ئومێد كاكەڕەش**

# ژیان و بەسەرهاتی شاعیر

(مـەزڵوم) نازنـاوی (سـەید ئەحمـەد)ی کـوڕی (سـەید محەمـەد)ی بەنایـە[1]، لـە بنەچەی شێخەکانی بەرزنجەیە (شێخ عیساو شێخ موسا).

لە ساڵی ١٩١٦ لە بەرزنجە لەدایك بووە، لەگەڵ لەدایکبوونیدا دایکی کۆچی دوایی دەکاتو ئەو منداڵە حەوت رۆژ تەمەنە لە دنیای پڕ چەرمەسەریدا بێ نـازی دایـك دەمێنێتەوە، بەهۆی نەنکییەوە (دایکی باوکی) گەورە دەکرێو نازی دەدرێتێ.

لـە تەمـەنی شـەش سـاڵیدا دەچـێتە قوتابخانـەو پـاش چـەند سـاڵێك وازی لێـدەهێنێو دەچـێتە حـوجرە لـە بەرزنجـە، لای مامۆسـتا (حـاجی شـێخ ئەحمـەد) خوێندوویەتی، پاشان روو دەکاتە شاری سلێمانیو دەچێتە مزگەوتی هەمزە ئاغا لای مامۆسـتا (مـەلا محەمـەدی کـوردی) دەسـت دەکـات بـە خوێنـدنو پاشـان دەچـێتە مزگەوتی (بـن تەبـەقی هـەرمن)و لای مامۆستا (مـەلا رەحیمـی پـەرخی) تـا عیلمـی سەرف[2] دەخوێنێو لە دوای ئەوە واز لە خوێندن دەهێنێ.

لە پاش تەمەنی چواردە ساڵی بۆ بژیوی ژیانی خۆی دەسـتی داوەتـە کەسابەتو بازرگانیی کوتاڵو وردەواڵە فرۆشـتنو دەسـتگێڕی، لەگـەڵ دۆسـتێکی (شـێخ ساڵح)ی کارژاوی زۆربەی دێهاتـەکانی ناوچـەی شارەزوورو قـەرەداغو بەرزنجـە گـەڕاونو لـەو ماوەیەدا دەستمایەیەکی باشی پێکەوە ناوەو دوکانێکی لە بەرزنجە داناوەو دەکەوێتە سەر کەسابەتی خۆی بە دوکانداری.

هـەر ئـەو دوکانـە دەبێتـە قەلەنـدەرخانـەو جێگـای پیـاوانی رۆشـنبیری ئـەو سەردەمەو هاتوچۆی شاعیرانو ئەدەبدۆستانو سیاسەتمەدارانو گـەورەپیاوانی مـیری کـە ئـاڵوگۆڕی باسـی ئـەدەبیو رۆژگـاری تێـدا دەکـرا. ئـەوەی کـە هانـدەری ئـەم بەیەکگەیشـتنو چـاوپێکەوتنانە بـووە، دەوری شـاعیر خـۆی بـووە کـە پیـاوێکی دەمڕاستو رێکخەری نێـوان خـەڵکی بـووە، هەمیشـە دەم بـە پێکـەنینو قسـەخۆشو

---

[1] سەید محەمەدی بەننا، وەستایەکی شارەزاو کارامـە بـوو لـە دروسـتکردنی خانوبـەرەدا بۆیـە ئـەو نازناوەی بەسەردا بڕاو بە شێخ مەحەمەدی بەننا ناسراو بوو.

[2] هەر لە هەمان هۆنراوەدا دەڵێت:

لـەگەڵ ئەم حاڵە بـێ فلـسو مـوفلیس
چوارده سـاڵ بـووم گـەیمـە تەسـریف

دڵفراوانو دڵسۆز بووە، دژی شێخو ئاغاو دەرەبەگ بووە، دەستی یارمەتیی درێژ کردووە بۆ هەژارانو نانبدەر بووە.

نیشتمانپەروەرییەکەی ئەوەندەی دیکە خۆشەویستی کردبوو لای خەڵکیو ئەو هەڵوێستەی وایلێکردبوو کە بە نهێنی پەیوەندی بە پارتە سیاسییەکانی ئەو سەردەمەوە هەبێت، تەنانەت هەوڵی دەستەمۆکردنی پیاوانی میری داوە بۆ پاراستنی گیانی ئەو کەسانەی کە ناویان بەهۆی سیاسەتی ئەو سەردەمەوە دەهێنراو مەترسیی گرتنیان بوو.

(مەزلوم) هاودەمی (موفتی پێنجوینی)و (قانع)و (شێخ سەلام)و (فەوزی)و (شێخ نوری شێخ ساڵح)و (شێخ جەعفەر حسین بەرزنجی)و (مەلا شێخ حەیدەری حاجی مامەند) بووەو هۆنراوەیان بۆ یەکتری ناردووە، بەداخەوە لەگەڵ ماڵئاوایی شاعیردا کە بەهۆی نەخۆشییەکی کتوپڕەوە لە رۆژی ١٩٥٥/٨/٩ لە تەمەنێکی کورتی (٣٩) ساڵیدا لە نەخۆشخانەی مەلەکی لە شاری سلێمانی چاو لێکدەنێو لەگەڵیدا دیوانەکەی دەپێچرێتەوەو بێناز دەمێنێتەوە.

## بۆ مامۆستا کزەڵ

بە ناوی بنەماڵەی (مەزلوم)ی شاعیروە گەرمترین رێزو سوپاسی خۆمان پێشکەش بە مامۆستای رۆشنبیرو دڵسۆزو بە وەفا مامۆستا مەلا مەحموود (کزەڵ) ئەکەین کە ساڵانێکی زۆر ئەم دیوانەی لە فەوتان رزگار کرد. هەروەها رێزو سوپاسی بێپایانمان پێشکەش بە مامۆستای ئەدیبو رۆشنبیر مامۆستا ئومێد کاکەڕەش) دەکەین کە دڵسۆزانە دیوانەکەی لە پاش پێداچوونەوە ئامادەی کردو پێشەکیی بۆ نووسیو سەرلەنوێ بە رێنووسی سەردەم دایڕشتەوە.

هەروەها رێزو سوپاسمان بۆ برای دڵسۆزو خۆشەویست مامۆستا حسین عوسمان نێرگزەجاڕی کە ئەرکی زۆری کێشا بۆ پێداچوونەوەی ئەم دیوانە، داوا لە یەزدانی گەورە ئەکەین کە هەردەم دەستبەکار بن بۆ خزمەتی ئەدەبی کوردی، خوا نموونەیان زیاد بکات.

**عمر سید احمد ( مەزلوم ) بەرزنجی**

# ئەم دیوانەم چۆن پاراست؟

لە کاتی سەرەمەرگیدا زۆر پەرێشان بوو، بانگی شێخ (محی الدین)ی ئامۆزای کردوو پێیگووت: من تازە ڕۆیشتم، بەڵام مەلا مەحمود (کزەڵ) بێکەسە لەم ناوچەیەدا، ئاگاداری بکەو پەیوەندیی لەگەڵدا مەبڕە تا ئەتوانی، بەڵێ خوا هەڵناگرێ تا لە ژیاندا بوو دۆستو دڵسۆزو برام بوو. وا ڕێکەوت هات بۆ لام، (شێخ محی الدین) ماڵی لە بەرزنجە بوو، دیوانەکەی دەستنووسی (مەزڵوم) خۆی هێنای بۆم بە نیازی ئەوەبوو بیخاتە ژێر چاپەوە، وتی: خۆت لەگەڵ خوالێخۆشبوودا ژیاویت، ئەزانی ئەو شیعرانە بە سۆنگەی چییەوە وتوویە، وەکیل بە ساغی بکەرەوە، بە خەتی خۆت چاك بینووسەرەوە لە یەك لاپەڕەداو ئەویتری با پاكو خاڵی بێت. منیش بە خەتێکی زۆر چاكو پاراو نووسیمەوە لەگەڵ پەراوێزدا، دامەوە دەستی خۆی بەڵام نوسخەی یەکەمی لای خۆم هێشتمەوە، بیرم کردەوە نەك ئەمەیان کارەساتی ڕۆژگار لەناوی بەرێت با بنەماکەی بمێنێتەوە.

بەڵێ مامۆستا (قانع) لە (شێخ محی الدین)ی وەرئەگرێتو ئەیباتو هەر ئەو بردنە بوو، وەکو زانیمان لەگەڵ هەندێك شتی نەختینەی خۆیو هۆنراوەی لە بیرێکدا گۆڕ ئەکرێ، ئیتر لەناو ئەچێت بۆ هەتا هەتایە.

شینمە، دیسان گەرمە شینمە
بۆ (مەزڵوم)و (قانع) هێزو تینمە
کەڵە مێردانی ئەم کوردستانە
ئاوا گۆڕ ئەبن لە بێ بینمە
ئەیانووت ئێوە چەواشە ئەبن
ئای لە ئەو ڕۆژە سەرەی قینمە

وا دووبارە لەسەر هەمان بنەما کۆنە دیوانەکەی پیائەجمەوە، ڕاستو لەنگو چەوتی ڕێنووسەکانی تێبینی ئەکەم، بە دڵسۆزییەوە نەمهێشت بفەوتێت. دەسا فەرموو کەسانو دڵسۆزانی مەزڵوم ئەوە ئەرزو ئەوە گەز، هیممەت بنوێنن تا مەزڵوم نەمرێت وەکو ئەو شاعیرانەی بێ ناونیشان سەریان نایەوە بە کوڵی ئەفسوسو کاشکیو ئەندۆهەوەو خۆزگەوە، بە ئەندۆهۆ کاشکییەوە کە پیا نەگەیشتبوو ڕۆیشت[1].

[1] شێخ عومەری کوڕی شاعیر دەستنووسی شاعیری بۆ هێنام کە بە خەتی شکستی فارسی نووسرابوو کە هەر ئەو دەستنووسەیە کە مامۆستا کزەڵ پاراستوویەتیو ناوی ناوە دیوانە کۆنەکە. ئەو دەستنووسەی مامۆستا کزەڵ ساغی کردۆتەوەو ئامادەی کردووە بۆ چاپ بە دەستمان نەگەیشت (ئومێد).

# بیرەوەرییەك

شاعیری پێشکەوتنخواز (مەزلوم) سید أحمدی شێخ محمدی بەننا دوکانێکی لە ژێر خانووەکەیداو لە ناوەڕاستی (برزنجە)دا کردبوو بە قەلەندەرخانەو یانەی رۆشنبیران‌و شاعیران‌و پیاوماقولانی سەردەمی خۆی.

من قوتابیی ناوەندی بووم لە سلێمانی سالی ١٩٤٧و سالانی بەرەوژوور، ئەو کاتە مامۆستا (قانع)ی شاعیر مالی لە بەرزنجە بوو لە قوتابخانەی ئەوێ وانەی ئەوتەوەو دوای دەوام کاتەکانی لای (مەزلوم) بەسەر ئەبرد بە شیعرو پەندی پێشینان‌و شیعری شاعیران‌و گولستان‌و بۆستانی سەعدی شیرازی کە مەزلوم زۆربەیانی لەبەر بوو، منیش لە پشووی هاوینا خۆم ئاوێتەی ئەو کۆڕو کۆمەلە ئەکرد، گوێم بۆ وتەکانیان شل ئەکرد، کاتێك مامۆستا (قانع) لەوێ نەما شاعیری خوالێخۆشبوو (شێخ أحمد شێخ غەنی) مامی (شێخ نوری شێخ صالح) نەقلی بەرزنجە بوو، بە هاتنی یەکسەر بەم مەلبەندی رۆشنبیرییە ئاشنا بوو کە ئەمەیش لە سەردەمی (هادی رشید چاوشلی)دا بوو کە یەکێ بوو لە عاشقانی ئەدەب.

(مەزلوم) مرۆڤێکی پێشکەوتنخوازو ئاشتیخواز بوو، هەمیشە وێردی سەر زمانی باسی نەتەوەی کوردو چۆنیەتی گەیشتنی بە مافی رەوای خۆی وەك گەلانی تری جیهان، لەو کاتەدا منیش لە بزوتنەوەی نیشتمانیدا کارم دەکرد، باسی خەباتی گەلان‌و چالاکییەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی نێو عێراقم بۆ دەگێڕانەوە، هەروەها لەوەش ئاگادارم کە ئەم شاعیرە پەیوەندی تۆکمەی هەبوو بە رێکخراوی (ئاشتیخوازانە)وە کە مامۆستا گۆران رابەریی دەکرد.

نەمری بۆ گشت شاعیران‌و ئەدیبانی گەلەکەمان.

**بابەعەلی شێخ ئیسماعیل بەرزنجی**
٢٠٠١/١٢/٧

# چەپکە تیشکێك

ئەوەی کەمێك لە ژیانی (مەزلوم)ی شاعیر شارەزا نەبێت وای بۆ دەچێت کە ئەم شاعیرە بە راستی مەزلوم بووە، هەرچەندە زۆرینەی شاعیرانی کورد تا رادەیەك چەوساوە بوون، بەلام بەندە ئەوەندەی لە نزیکترین کەسی خۆیەوە بۆم باسکراوە خۆشگوزەران و ژیانی ئاسایی بووە، بگرە لەچاو ژیانی ئەوکاتەی شارۆچکەی بەرزنجەدا وەك سامانداران ژیاوە، پێدەچێت لە ژیانی سۆزداریدا مەزلوم بوو بێت، لێرەدا گوتەیەکی (ستیڤن سپینەر)ی شاعیرم دێتەوە یاد کە دەڵێت: خۆزگە وەك شاعیرێکی ئینگلیزی دەژیام و وەك شاعیرێکی عەرەب دەمردم چونکە ئەوەی لە مردنی شاعیرێکی عەرەبدا خەرج دەکرێت خودی شاعیر نیو هێندەی لە ژیاندا بۆ خەرج نەکراوە.

بەلام (مەزلوم)ی شاعیر وەك (مەلیحەخان)ی خێزانی بۆی باس کردووم وەك هەردووکیان ژیاویشەو مردووشە، مەزلوم چەندە ژیانی لا خۆش بووە هێندەیش لەوە گەیشتووە کە ژیانی بە بێ رەنج و ماندووبوون، بە بێ خەبات و قوربانیدان گەشە ناکات و سەقامگیر نابێت، دەنا (مەزلوم) بۆ هاوکاریی پارتە نهێنییەکانی ئەو کاتە دەکات، بە بەیاننامەو ئەدەبیاتیان لێوەردەگرێت و دەیانهێنێت بۆ بەرزنجە؟ دەنا بۆ دەچێتە بزوتنەوەی ئاشتیخوازان کە مامۆستا (گۆران)ی نەمر ئەندامی کارای بووە؟ دەنا بۆ وا بە توندی ستەم و ستەمکاران بە شیعر دادەشۆری و ریسوایان دەکات؟ دەنا بۆ لەگەڵ شۆڕشگێڕێکی بزێوی وەك (شێخ جعفری شێخ حسین) دەست تێکەڵی دەکات و قەلەندەرخانەکەی دەکات بە مەکۆی خەباتگێڕان و رۆشنبیران؟!

لە رۆژگارێکدا کە دیوەخانەکانی شاری سلێمانی وەك ماڵی شێخ لەتیف و حەمەی ئەورەحمان ئاغاو عزەت بەگ و...... رۆڵێکی کاریگەریان دەگێڕا لە بواری گەلالەبوونی هەڵوێستە سیاسییەکان و راپەڕینە جەماوەرییەکاندا، بەڵێ لەو کاتەدا قەلەندەرخانە چکۆلەکەی (مەزلوم) و دوکانەکەی لە بەرزنجە هەمان رۆڵیان گێڕاوە چ لە ئاستی ناوچەی بەرزنجەو چ لە شارۆچکەی خۆیدا.

شاعیری میللی کورد (مامۆستا قانع)ی نەمر شاعیری هەژاران بوو، دۆستێکی زۆر نزیکی مەزلوم بوو، سالانە سەردانی بەرزنجەی دەکرد، جارێك بە قانعی گوت بۆ

وا رووتەڵەو شڕپۆشیت، ئەگەر پێت خۆشبێت لە سلێمانی دوکانێکت بۆ دائەنێم، هەر کڵاوی تیا بفرۆشەو ئیتر لەم شڕۆڵییە رزگارت دەبێت. (قانع)یش دەڵێت سید أحمد بڕوا بکە ئەگەر من دوکانی کڵاوفرۆشی دابنێم خوا لەمەودوا مرۆڤ بە بێ سەر خەلق ئەکات!.

لە کۆتاییدا من لەوە دڵنیام کە کاروانی رۆشنبیریمان لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکاندا لە خۆڕا چالاك نەبووە، دەیان شاعیری وەك (بێکەس)و (پیرەمێرد)و (قانع)و (مەزلوم)و (سەلام)و (موفتی توتنچی)و (بەنگینە)و (کزەڵ) ئەو کاروانەیان چالاکترو دەوڵەمەندتر کردووە.

ئەوەی شیاوی باسە بۆ رێزنان لەم شاعیرە لێهاتووە کۆمەڵێك لە دڵسۆزان و رۆشنبیران لە رۆژی (١٩٨٧/٤/١٠)دا یادێکی شکۆمەندو شایستەیان لە بەرزنجە ساز کرد بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانی سلێمان و دەوروبەر، چەندین گوتارو پارچە شیعری تیا خوێندرایەوە.

هەزاران سڵاو لە گیانی عاشقانی وشەی کوردی بە تایبەتی (مەزلوم)ی شاعیر.

**حسین عوسمان نێرگسەجاڕی**
**سلێمانی**
**٢٠٠٢**

# ئەی وەتەن جەنناتی دنیام

ئـەی وەتـەن جـەنناتی دنیـام.. خـاکی کوردسـتانته[1]
حەوزی کەوسەر، ئاوی سـافی، چـەشمەکەی کوێسـتانته[2]
لـەزەتی میـوەی بەهەشـتی، تـەعمو بـۆی تـۆ ئـەدا
سـێو و هـەرمێو هـەنارو میـوەی بۆسـتانته[3]
وەقتـی نـەورۆزی بـەهاری، گـوڵ کـە خێمـە هەڵبـدا
سـەد (ئـیرەم) لای نانوێنـێ (رەوزەی ریزوانتـە)[4]
خوا لـە قورئاندا ئەفەرمووێ وەسفی جەننـەت بـێ میسـال
وەك سـەفای بـاغی میللـیو ئـاوی کانێسـکانته
ئەی وەتەن شایانی مەدحـە، شـاخو دەشـتو کێوەکـەت
یەك بە یەك ئەشـکەوتو غـارت، قەسرەکەی عەدنانتـە
گـەر سەریشـم دابنـێم، دایـم لـە وەسـفت هـەر حەقـە
نەقـدی جانیشـم فیـدای لاوەکـەی کوردانتـە
بولبـولی عاشـق بـە حوسـنی غونچـەکەی بـاغی گوڵـت
هـەر وەکـو (مـەزڵوم) بـە دائـیم عاشـقو حەیرانتـە

---

[1] جەننات: بەهەشت.
[2] چەشم: سەرچاوە.
[3] بۆستان: باخو باخچە.
[4] ئیرەم: باخێکە لە بەهەشتا هەروەك (رەوزەی ریزوان).

# ئەی وەتەن موشتاقی تۆیە

ئەی وەتـەن موشـتاقی تۆیـە، کـورد زوبـانی سـەر زەمـین
ئـــارەزووی گەرمییانـــە، عاشـــقی کوێســـتانی شـــین
تـۆزی خـاکی کوردسـتانە، سـورمەیە بـۆ چـاوی کـورد
وردە بـەردت چەشـنی گەوهـەر، پووشـەکانت یاسـەمین
ئـاوی سـافی چـەشمەکان‌و شـەوقی بـەفری کێوەکـان
هاڕەهـاڕی نـەهرەکانت میسـلی فیردەوسـی بـەرین
هەر زەمانـێ تـۆ کـە پۆشـیت بـەرگی سـەوزی نەوبـەهار
دێتــە ســەیرانت بــە جــارێ، چــەند جـوانی نـازەنین
ڕۆژی ســەیرانە، ئــەبینم تــاقمی کــوردی جــوان
دێـن‌و دەڕۆن وا بـە نەشئەو دەم بـە کـەیف‌و پێکـەنین
ئێمــە ئــەولادی کــوردین‌و کوردســتانە جێگــەمان
بـۆ (تـەرەقی) نیشـتمانی‌و بـۆ عـیلم، تـا (چـین) دەچـین[5]
ئـەی جـوان‌و لاوی کـورد، عـیلم‌و زانـین فـەرزە بـۆت
بـا بخـوێنین، بـا سـەعی کـەین، تـا لـە عالـەم دەرکـەوین
وەك عەرەب دەستم بە دامان ئەی ڕەفیقـانی کـورد زوبـان
بـا وەکـو (مـەزڵوم) نـەبن چـاو بـە گریـەو دڵ حـەزین

[5] تەرەقی: پێشکەوتن، سەرکەوتن.

# ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی

ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی لای من و ئەحبابەکەم
مەزرەعەی عیلم و فەننی، تۆی مەنبەعی ئەفکارەکەم[١]
تۆی وەتەن، مایەی سروودو مەرهەمی ئازارەکەم
رەونەقی باغی علوم و مەعدەنی ئەسرارەکەم
بۆ (بەیانت) هاتە جەنبووش، وا دڵەی ئاوارەکەم[٢]

☆ ☆ ☆

قەومی کورد ئیتر لە ژێر باری میحنەت بێتە دەر
تەوقی زیللەت با فڕێدەین، تاجی شاهی کەینە سەر
حوڕو مەزبوت، با بە جارێ شاەو دەروێش و بەگلەر[٣]
گۆی جەهالەت بە چۆگانی عیلم و فەن دەرکەینە دەر[٤]
لێبدەین چەپڵەو بخوێنین (شەرقیە)و ئەشعارەکەم[٥]

☆ ☆ ☆

نەمامی نەورەس و تازە جوانانی وەتەن
عاقڵ و هوشیارو وریا، پڕ لە دەرك و عیلم و فەن
بێنە مەیدانی فەساحەت بولبولانی رووی چەمەن
جان فیداو، جان نسارین بۆ تەرەقی رێی وەتەن[٦]
با هەموو یەك بین و تێکۆشین لەسەر ئیقرارەکەم

☆ ☆ ☆

خەوی غەفڵەت تا بە کەی وا نۆبەتی هۆشیارییە
نۆبەتی عیلم و فنون و نۆبەیی بێدارییە
لەم زەمانە دەردی جاهیل هەر بە دانا کارییە
دەردی جاهیل بێ دەواو سەعب و سەخت و سارییە[٧]
بۆیە (مەزڵوم) هاتە جەمبوش ئەو دڵەی بێچارەکەم

---

[١] مەنبەع: سەرچاوە. [٢] جەنبوش: جوڵاندنەوە. [٣] حوڕ: سەربەست. بەگلەر: بەگ.
[٤] گۆی: خڕە وەك تۆپ و لە دارە گەمەیەکی کوردییە. چۆگان: گۆچان. [٥] شەرقیە: سروودی نیشتمانی.
[٦] جان نسار: گیان بە قوربانکردن. تەرەقی: پێشکەوتن، سەرکەوتن. [٧] سەعب: گران.

# ئەی وەتەن بۆ سیسە ڕەنگت

ئـەی وەتـەن بـۆ سیسـە ڕەنگـت وا پەشـێوە حاڵەکـەت
شـەوقی ئیقبالـت نـەماوە، وێـران دیـارە ماڵەکـەت
لەشکری عـیلمو فنونـت چـی بەسـەر هـات، کـوێ ڕۆیـی
وا زەلـیلـی دەسـتی جەهلـە، عـاقڵو هوشـیارەکەت
عەسـکەری غـەم لاوەکـانی تێکشـکانو ڕایفـڕان
بۆیـە ئەسـیرن وا بـە جـارێ نـازکو نازدارەکـەت
ڕەببـی مووسـایەك بنێـرە قـەومی کـورد گشـت یـەکبخا
یـا دەلیـلێ تـۆ عەتاکـە بـۆ کـوردە هەژارەکـەت
خـۆ ڕەزامەنـدین ئیلاهـی، دەربچـێ بـا ڕۆحو جـان
بـا نـەمێنینو ڕزگـاربین گشـت لـە دەست ڕۆژگارەکـەت
تۆ لـە (مەزڵوم) مەگرە عەتەب ئەی وەتەن سـەدجار دەخیـل[2]
با سەراسەر خۆ لـە قـوڕ نـێم بـۆ کوردەکـەی غەمبارەکـەت

---

[2] عەتەب: تانەو تەشەر.

# نەورۆز

نــەورۆز بــەخێربێ، جــەژنی نەوبــەهار
دنیــات نــەجات دا، لــە ســەرما یــەکجار
ســوپای عــەدلی تــۆ گەیشــتە لامــان
نــوقمین لــە گوڵــدا ســەرتابەدامان
بـە هـەوات لـە جێـی گـەرمیانو کوێستان
گــوڵ خێمــەی هەڵــدا بەیــداغی چــەقان
درەختــی دەشــتو چــیاو لاپــاڵان
کردیـان بـە بـەردا کـەوای سـەوزو جـوان
دەسـتەی گـوڵی جـوان، پەسـەندی نـازدار
خــۆی ئاریشــدا لــە کــانیو کۆســار
نێرگسی رووخۆش وەك جـوانی سـەر مـەس
خۆی کرد بە سـاقیو پیاڵـەی زەڕ بـە دەس[1]
(کــەنێرە) بــۆنی خۆشــی حــازر کــرد
بــە بــۆنی خۆشــی جیهــانی پــڕ کــرد
لــە وشــکە چــەمان، ئــاوان جـاری بـوون
ئاوەڵو چەمەن گشت سـەوزو شـین بـوون[2]
هــاژەی قەڵبــەزان شمشــاڵی لێــدا
بــای وەعــدەی بــەهار لــە هەڵپەڕکێــدا
مــەلانی عاشــق لــە گــوڵزاری شــین
بەســتە ئــەخوێنن بــە لەهجــەی شــیرین
گــڕ وەك ئــاگری زەردەشــت هەڵگیرســا
(مــەزڵوم) لــە مــەدحت دەنگیشــی نووســا

[1] زەڕ: زەڕلی، جۆرە پیاڵەیەکە بۆ چا خواردنەوە بەکار دەهات.
[2] ئاوەڵ: چەمو کانی چکۆلە.

# جەنگی دووەم

مــوژدەی نەســرەتە لــە هــەموو لاوە
ئەڵـــەمانیان شـــکان، گـــەڕاوە دواوە
لەشکری چەرچڵ وەك شـێری جـەنگی
هێتلـــەری تـــەواو هێنایـــە تـــەنگی
ئیتالیـــای لێکـــرد وا پشـــتی شـــکا
نفـــوزی نـــازی لای چەرچـــڵ نـــەما
هێتلـــەر هـــاتووە دوژمـــن بکـــوژێ
هەر خۆی لـە مەیـدان خـوێنی ئـەڕژێ
کـردەوەی وایــە لــە زووەوە ئـەڵمان
شـــەڕی خـــۆترێن ئـــەکا بێگومـــان

☆ ☆ ☆

کـوا هـەراو گـوڕەو گـەزافی هێتلـەر
ئـــەیووت ئـــەیگرم میســـرو ســـکندەر[٣]
ئەو دنیـای بـە گـای بـێ کـاوان زانـی
بگـــرێو بکـــوژێو بکـــا تـــاڵانی
لــە بـۆ ریشـی هـات سمێڵــی نـا بـان
کـــردەوەی وایـــە هێتلـــەری تـــاوان
لای ئینگلیـــز، ئـــەڵمان نیـــەتی نگـــین
وەك شـــەڕی پێشـــوو ئەیباتـــە بـــەرلین

---

[٣] مەبەست لە شاری (ئەسکەندرییەی میسرە).

# من کچە کوردێکم

من کچە کـوردێکم هوشـیار
پوختـــەو خـــاوێن‌و نـــازدار
ئەچـــمە مەکتـــەب ئـــەخوێنم
رەگـــی جـــەهل دەردێـــنم
کـــە خوێنـــدنم کـــرد تـــەواو
ئـــەبم بـــە کچـــێکی ناســـراو
لـــە رێـــی بـــەرزیی وڵاتم
ســـەر دانانـــە ئـــاواتم
بـــۆ خزمـــەتی هۆزەکـــەم
لـــە مەیـــدانا تـــۆز ئەکـــەم
بـــە شمشـــێری ئیتیفـــاق[1]
دەردێـــنم رەگـــی نیفـــاق
خوومـــە راســـتی‌و ئـــازادی
ئـــەژیم بـــە خۆشـــی‌و شـــادی

[1] ئیتیفاق: یەکگرتن.

# منداڵێکی بچووك

مــن منـــداڵی بچـــووکم، عـــومرم ســـاڵی تـــەواوە
گـــەر ئەپرســـی لـــە نـــاوم (عەبدولحەمیـــد)م نـــاوە
بـــابی منـــە (ســـەید ئەحمـــەد) لەقەبەکـــەی (مـــەزڵوم)ە
ئیســـمو شـــوهرەتو کونیـــەی لـــەم نـــاوەدا مەعلومـــە
لـــە رووی لوتـــفو مەرحەمـــەت، نەســـیحەتی ئـــەکردم:
لـــە بـــۆ عـــیلمو مەعریفـــەت بـــەرەو خـــۆری دەبـــردم
رۆڵـــە، هـــەتاکو لاوی لـــە بـــۆ عـــیلمو مەعریفـــەت
ســـەعیکە تـــۆ بـــە دائـــیم، بگـــرە رێگـــەی حەقیقـــەت
شـــوعلەی عیلمـــت دەربخـــە لـــە تـــاریکی جەهالـــەت
دڵ پـــڕ بکـــە لـــە شـــەوقی عـــیلمو فـــەنو عەدالـــەت
ئـــەبێ خزمـــەتی وەتـــەن بـــە دڵ، بـــە فـــەرز بزانـــی
(حـــوببی وەتـــەنت بـــێ)، ســـاحێب دیـــنو ئیمـــانی
نەســـەبی خـــۆت بناســـە بزانـــە کـــە تـــۆ کـــوردی
ســـاحێبی شـــاهۆ ســـوڵتان خـــاوەنی شـــێرو گـــوردی
بـــۆ ناســـینی قـــەومی کـــورد عـــیلمو تـــەئریخ بزانـــە
بـــە چـــاوی خـــۆت ئـــەبینی کـــە کـــورد شـــێری ژیانـــە
چـــەند شـــاهۆ، چـــەندە ســـوڵتان لـــە تەئریخـــدا بەیانـــە
یەکـــە پیـــاوێ مەشـــهوورە ســـەرکردەی میدەکانـــە
کـــوردانی بـــاوكو بـــاپیر (مـــەزڵوم) نـــەبوون وەك ئێمـــە
ئـــەیان گـــوت کوردســـتان دایکمـــە هـــەم نیشـــتەجێمە

# چاوێ هەڵبێنە[1]

چـــاوێ هەڵبێنـــە، چـــاوێ هەڵبێنـــە
گیانە بە عیشـوە بـەس خـۆت بنوێنـە
ئـــارام لـــە دڵـــی عاشـــق مەسـێنە
تۆبیـــو جوانیـــت جـــەفا مەنوێنـــە[2]
وەکـــو عاشـــقان چـــاوێ هەڵبێنـــە

☆ ☆ ☆

بە چـینی زوڵـف‌و پەرچـەمی زەردت
بە ورشەو پرشەی گۆنـای بێگـەردت
بە لـەهجەی خۆش‌و شـیرینی فـەردت
هـــەرمن موبتـــەلام بـــە داوی دەردت
سـا بـە نەزاکـەت چـاوێ هەڵبێنـە

☆ ☆ ☆

عاشـــقم، ســـەبرم زۆر لا گرانـــە
راســـتە (دڵـــداری پـــەنهانی) جوانـــە
دڵـــدار شـــەرمن بـــێ زۆر بـــێ ویجدانـــە
لـە کوێ رووپۆشین پیشـەی جوانانـە؟
سـەرپۆش فڕێـدەو چـاوێ هەڵبێنـە

☆ ☆ ☆

---

[1] ئەم هەڵبەستە لە گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی پێنجەم، ژمارە/ ٥، تەمموزی ١٩٤٤دا بڵاو کراوەتەوە.
[2] جەفا: ستەم.

بــۆ خــۆت ئــەزانی گرفتــاری تــۆم
کــردەوەی تۆیــە زامــانی بــە ســۆم
بــۆ تــۆ دێوانــەو دیــڵو ڕەنجــەڕۆم
خۆشــم نــازانم ڕووەو کــوێ بــڕۆم
بــۆ منــی هــەژار چــاوێ هەڵبێنــە



ئــەزانم نــەرمو نــازکو تــەڕی
بــە خشــڵی جــوانی پۆشــتەو بەفــەڕی
ڕەنگینــی دەڵێــی گوڵــە شەســتپەڕی
پــێم نــاڵێی بۆچــی لێمــان بــە شــەڕی
یــا جوابــێ بــدە یــان چــاو هەڵبێنــە



بــۆ خــۆم فامــانم ئــەبێ بــە ئێشــم
ئــەبێ بــە نەشــتەر دڵــەی پــڕ ئێشــم
ئــەبێ بــە ئــازار دەروونــی ڕێشــم
هــەتا کــەی ســزاو ناســۆر بکێشــم
بــۆ دەوای دەردم چــاوێ هەڵبێنــە



# میوانی تۆم

میــوانی تــۆم ئــەم ئێــوارە، تــۆ بزانــە بــە یــەکجار
ماچــم ئــەوێ، ماچــم ئــەوێ، ســەیرانێکی بێشــمار
داوا ئەکەم مەقســو دەکــەم! نیگایــەکی گــەرمو گــوڕ
دەم بخەرە ناوی دەمــم دەســپێبکەین (بــۆس‌و کــەنار)[1]
لــە باخاتی حوسنی سینەت بــە موحیبــەت پێم عەتاکــە
دوو لیمــۆی (تــازە دەســی) نــازەنینی نەزاکەتــدار
لــەم دەعوەتــە بــا فرســەتبێ بــێ تۆبیــو خــوا رەقیبــانم
با سەراسەر خــۆ لــە قــوڕنێن ســەرو دامــان تابــەخوار
باکت چییە (مەزڵوم) ئەمڕۆ ئەم دەعوەتە هەر بــۆ تۆیــە
بخۆ بخۆ نەفست کوێرکە لــە چیمەن‌و بــاخ‌و گــوڵزار

---

[1] بۆس: ماچماچێن.

# غەزال

مەعشــوقی منــە، غــەزال دولبــەرم[٢]
مــەحبوبی خۆمــە شــێوەی ســـروەرم
چــاوم چــاوەڕێی فــەرمانی عەینـــە[٣]
دڵ پەشـــێواوی خـــەمی زوڵفەینــــە
بــاغی ئیرەمــم خــەت و خــاڵی لــەیل
کــانی گەوهــەرم کــەلامی بــە مــەیل[٤]
هەتا مەیلت بـوو، عەشـقت لـە سـەرما
بــە بــێ مــەیلی تــۆ دڵ شــەوقی نــەما
پیشــەی فــەرهادەو، مەجنونــە کــارم
وێــڵ و ئــاوارەی کــەژو کۆســارم
کتێــە: کەشــکۆڵ، قەڵەمــە: عەســام
دەروێشــی ئەکــەم تــا (یــوم القیــام)[٥]
(مەزڵوم)ی یێکـەس بـێ بـەهرەو ئیقبـال
پشــتیوانت بــێ یــەکتای (ذو الجــلال)[٦]

---

[٢] غەزال: ئاسك.
[٣] عەین: چاو.
[٤] کەلام: قسە.
[٥] یوم القیام: رۆژی هەستان، رۆژی زیندووبوونەوە.
[٦] ذو الجلال: خاوەن شکۆ (مەبەست لە خوایە).

# کوشتمی

کوشـــتمی عەشـــقم نـــەما
بـــەزەیی پیامـــا نـــەهات
نـــەفرەتی کـــردم کچـــێ
بـــۆ دەوای دەردم بـــدات
مایـــــەی ســـــوتانمە
مەرهـــــەمی دڵـــــی زارم
خســـتمییە بـــەحری میحنـــەت
بـــۆ شـــیفای دەردم نـــەهات
کەمەنـــدی هـــەردوو پامـــە
وا ئەســـــیری خـــــەراباتم[1]
بـــە دائـــیم قـــورِ دەپێـــوم
بـــەڵکو یـــارم نیگـــا بکـــات
بـــۆ دڵـــی لـــەت لـــەت کـــردم
رەفیقـــی چـــۆڵو دەشـــتم؟
دەرمـــــانی دەردم بکـــــە
لێـــو لەســـەر لێـــوم بخـــات
فرێـــی دە بـــا دەرکـــەوێ
وردە خـــاڵی دەوری لێـــوت
ئەگریجـــەی خـــاوو زەردت

[1] خەرابات: مەیخانە.

دەمـــاغم بـــۆ موعەتـــەر کـــات
توخـــــوا شـــــیرین ئاســــــا
بـــە نـــاز منـــی بێکـــەس بلاوێنـــە
برێـــژە خـــوار ئەشـــکی خـــوێنین
بـــۆ مەزرەعـــەی جـــەورو جـــەفات
گرفتـــــاری دەردی عەشـــــقم
وەکـــو فـــەرهاد غـــەرقی خـــونم
ئینتزاری وەسـڵی تۆیـە (مـەزڵوم)
(حـــین یـــأتي وقـــت الوفـــات)[٢]

[٢] هەتا ئەو کاتەی دەمرێت.

# لوتفی یارم

کە مـن لـوتفی ئـەو یـارم بـێ بـە سـەروەتی دنیـای نـادەم
هـەتا لەنجـەی دڵـدارم بـێ بـە زینـەت و زێبـای نـادەم
کەمـەر بەسـتەی عەشـقی یـارم لـە دنیـادا هـەتا مـاوم
چاوی رەشی مەحبوبی خۆم بـە سـەد بـەهێ و رەعنـای نـادەم
وەکو سۆفی لـە خـەڵوەتام بـە دڵ ئەکـەم سـەنای دولبـەر[1]
ئەمن نیمـە خـولقی (هـاوهو)، دەس لـە دەف و عەسـا نـادەم
دەسـتەو دوعـام مـن بـە دائیم لـە حـزووری دیـوانی خـوا
ئەگەر حیفزی نەکا حافز گوێ بـە نوشـتەی شـێخیش نـادەم
دە (فیردەوسـی) بڵـێ بـۆ مـن ئـەی دولبـەری ئـاوارەخور[2]
ناکەم یادی (خاڵەی رێـوار) بـە حـەیران و ئـای ئـای نـادەم
لـە نەزعایـە (مـەزلوم) ئـەڵێ ئەگـەر یـارم بملاوێنـێ[3]
نییـە بـاکم بـە یاسـین و بـە تـەڵقینی مـەلای نـادەم

---

[1] سەنا: ستایش، مەدح.
[2] فیردەوسی: ناوی سترانێك بوو لەو رۆژگارەدا.
[3] نەزع: گیانکێشان.

# سادەپەرستی

هەرکەسێ نەیبێ سادە رووخێکی لە دیوانا[٤]
مایەپووچو رووتو قووت بێ لە دینو لە ئیمانا
هەرکەسێ سادەپەرستە بیپارێزە ئیلاهی
لە غەمو دەردو بەڵاو موسیبەت لە جیهانا
مورشیدە، سادەپەرستی، موریدیەتی، ئەمانە:
خورشیدە چ فەرهادە، چ یوسف لە زەمانا
عەزیزە، خۆشەویستە، موعتەبەرە، براکەم!
ئەم عەشقە لە نەزەر ئەهلی عەشقو ئیمانا
تەسخیرو کەمەندکێشی ئەم عەشقەیە بزانە:
سەد یوسفو زلێخا شۆڕەسوارن لە بیابانا
سەربەستو هونەرمەندە، چاپووکە عاشقی
چالاكو جەسوورە، چ شێرێکە لە مەیدانا
ئوسوڵو قاعیدەی عاشق وەهایە (مەزڵوم)
سووتانە بە بێ دەنگی لە بەیانا

---

[٤] سادە رووخ: ئافرەتێکی جوان.

# هەر لە ئەزەل

هەر لە ئەزەل بوو بە ئیرسم هەمی دڵو غەمی دنیا[1]
جێنشینی فەرهادمو میراتگری عەشقی لەیلا
بێنسییە دڵی زارم لە سەروەتی وەسڵی یارم
بوونە عەدو کەسوکارم، دوژمنانن ئەکا تکا
غەمی زەمان رەفیقمە، فیراقی یار حەریفمە[2]
کەسوکارم رەقیبمە، بابو مامە لەگەڵ برا
بێگانەیە بە من تالیعو شانس، رۆیی کەماڵ[3]
دێوانەیە فیکرو خەیاڵ، زەوقی نەما دڵ ئەبەدا
تاراجی کرد عەقڵو دەرکم شاهی عەشقت (وا ئەسەفا)!
خاڵی ماوە خێمەی خەیاڵ سوڵتانی دڵ ئەسیر کرا
ساتێ نەبوو کە فاریغ بێ (مەزڵوم) لە دەس هیجرانی یار
ساتێ نەبوو ئاسوودە بێ لە زوڵمی تۆ ئەی بێوەفا

---

[1] هەمی: خەفەتی.
[2] حەریفمە: هاودەممە.
[3] تالیع: بەختو ناوچەوان. کەماڵ: لاوی، جوانی.

# بە ئەمری زاتی سوبحانە

بــە ئــەمری زاتــی ســوبحانە کــە ئــەمڕۆ جــەژنی قوربانــە
هــەموو عالــەم موعەتتــەر بــوو بــە بــۆی ڕێحــانی جانانــە
سەراسەر خامەکی ئەخزەر کە پۆشی خــواروو ژوورو ســەر
حەزین بــوو جیهــان یەکســەر، بــە بــۆی مشــکینی خوبانــە[٤]
وەکو قەوس‌و قەزەح وایە کــە ســەوزو ســووری لەبەردایــە
ئــەڵێی جــەناتی دونیایــە کــوڕو کــچ حــۆری‌و غیلمانــە
بــە گــوڵزاری موعەتتــەردا، بــە ئــەبرۆی مــودەوەردا
بــە رووخســاری منــەوەردا ئــەڵێی مــاهی تابانــە
بە مەدحی بەرزی باڵای یار بە وەسفی جوانی کاڵای یار
بــە ســوخمەی ئــاڵو واڵای یــار، هــەزاری شــێت‌و دێوانــە
لە تاو چــاوی عــەیاری تــۆ لــە دەس زوڵفــی رەشمــاری تــۆ
لەبەر جــەورو جــەفای تــۆ کــە (مــەزلوم) مــات‌و حەیرانــە

---

[٤] موشکین: ماددەیەکی بۆنخۆشە.

# موسوڵمانان چ غەوغایە

موســـڵمانان چ غەوغایـــە، کـــەوا کەوتۆتـــە دنیـــاوە
لـــە مـــەغریب روو بـــە مەشـــریقە، تلـــوعی رۆژ ســـەری داوە
سەراســـیمەو (پەرێشـــان دڵ) رووەو مـــەغریب نیگـــاهم کـــرد
کـــە دیـــم چـــەشمی نیگـــاری مـــن لـــە گوڵشـــەن شـــوعلەی داوە
بـــە شـــوعلەی دیدەهـــەڵهاتن، ئـــەوی عاشـــق بـــوو هـــەڵهاتن
کـــە دوژمـــن عاشـــقانە وا ســـوپای بـــۆ ئێمـــە هێنـــاوە
هەردوو سەری کوڵمی ئەڵێن شوعلەی شەمس و قەمەرە چـییە؟
ئـەمیان ئـەڵێی مـەهی چـواردە، ئـەویان تەعنـەی لـە رۆژ داوە
شـەهدی دەمـی بـە شـیرینی دەعـوا لەگـەڵ کەوسـەر ئـەکا
سـیاماری سـەری زوڵفـی کـە پێچـی حوسـنی خـۆی داوە
منـی (مـەزڵوم) گرفتـارم لـە دەس سـیحرو جـادووی دولبـەر
عـەجایب تـەبعی ناسـک بـوو کـە ئـەم چـەند شـیعرەی دانـاوە

# بۆچی نەبم بە دێوانە

بۆچـی نـەبم بـە دێوانـە، بـۆ شـێت نـەبم لـە داغـی تـۆ
بۆچ نەسووتێ وەك پەروانە، دڵ لە کوورەی فیراقـی تـۆ
دڵی بردم لەنجـەو لارت، شـێتی کـردم چـاوی کاڵـت
پابەندمە دانـەی خاڵـت، بـە دوو ئـەبرۆی کـەمانی تـۆ
لەتلـەت بـووە دڵـی زارم، دڵ پـڕ غـەمو پـڕ ئـازارم
وا کوشـتمی ئـەی نیگـارم، گێلگێلـەو پەرچـەمی تـۆ
خوێناوی بوو دەستی لەیلم بـە خوێنـاوی دڵـی کـەیلم
ئەسـیر بـووە دڵو مـەیلم بـە پەرچـەمی سـیاهی تـۆ
بۆ نەڕژێ ئەشـکی خـوێنین لـە چـەشمەی دڵـی حـەزین
بۆ دەرنەچێ سەیلی ئەسـرین لـە کانیـاوی جـەفای تـۆ
لە نەزعایە (مەزڵوم)ەکەت تانـە مـەدە لـە مەعشـوقت
عیلاجیکـە مەحبوبەکـەت، بـا نـەیکوژێ جـەفای تـۆ

# دڵ پەرێشانە

دڵ پەرێشانە لە دووریت بە سێ دەرد، ئەی دولبەرم
یەك بە فیرقەت، دوو بە هیجران، سێ دوژمنی بێفەڕم[1]
بۆ دڵی بیماری من هەر لە دونیا سێ بەلایە
یەك برینداری، دوو نەخۆشی‌و، سێ شەهیدی خەنجەرم
مانعی وەسڵی من‌و تۆن، سێ گرۆهی شەرمەزار
یەك رەقیب، دوو بەخیل‌و، سێ دوژمنی بێشەرم
مەرهەمی دەردی دڵم هەر لە دونیا سێ دەوایە
یەك تەبیب، دوو دەلیل‌و، سێ ویسالی مەنزەرم[2]
دەردی دڵم گەر دەپرسی لەتلەتی سێ شت بووە
یەك بە تەعنە، دوو بە لۆمە، سێ بە خەندەی مەحقەرم[3]
ئاهی (مەزڵوم) گەر ئەپرسی بەم سێ وەسفە چارییە
یەك شەهادە، دوو شەفاعەت، سێ دیوانی مەحشەرم

---

[1] فیرقەت: دووری، جودایی. عەدوو: دوژمن.
[2] مەنزەر: ئەو جێگەیەی چاونیگاو سەرنج رادەکێشێ.
[3] تەعنە: سەرزەنشت. مەحقەر: ناحەز.

# چاوی کاڵت

چـــاوی کاڵـــت وا ئـــەزانم فیتنەیـــەو قاتیـــل
تیغـی ئـەبرۆت وا لـە کـارداو لەنجەکـەت مائیـل[٤]
خەنـــدەکانت ئـــەمکوژێت‌و خاڵـــەکانت داومـــە
خەنجـــەر ئاســـا موژگانـــت، زوڵفەکـــەت هائیـــل
گوارەکـانی بـانی شـان‌و پلپلـەی بـانی سـەرت
سلسـلەی گێسـوی سـیاهت وەك ئـەژدیها حاسـیل[٥]
جەرگ‌و دڵ سـووتاوی تۆیـە، عەرعـەری نازدارەکـەم!
بۆکـــوروزی دڵ لـــە عالـــەم بۆتـــە ئـــاگری نائیـــل
گـەه بـە عیشـوەو لارو لەنجـە، گـەه نیـازی نـازەنین
گەه بە غـەمزەو لارە پێچـت، لـە کـن نیگـات واسـیڵ
کوڵمی سوورت کوشتمی، ملوانکەکـەت زنجیری پێم
جـا بـە تـەحقیق بـێ نـەجاتم یـان هـەروا دەبم زەلیـل
قاسـیدی قـەلبی حـەزین تـەبلیغی (مـەزڵوم) ئـەکا
میسـلی فـەرهاد لەشـکری غـەم، واعیـەو شـامیل

---

[٤] مائیل: حەزلێکەر.
[٥] حاسیل: ئەمێنێتەوە.

# ژن[1]

ئاخ لە بۆ ژنێك كەمێ نیوداشت بێ
بەڵام بە شەرتێ بەكەڵكی داشت بێ
بۆ فەقێو حوجرە چاكو دەمدوو بێ
لەگەڵ هەموویان رووخۆشو ئاشت بێ
ڕێزیان لێبگرێ بە میهرەبانی
خزمەتكردنیان بە بێ پاداشت بێ

# كوڕ[2]

كوڕ لە كوێ ئەبێ پیشەی كچی بێ
سووراوی كوڵمو بۆیەی لچی بێ
سمێڵ نیشانەی پیاوە بیتاشی
دائیم خەریكی شانەی پرچی بێ
با هەستێ ڕۆحی بخاتە سەر دەس
پێشەنگی خەبات بەر نەدا بۆ كەس
تا گەڵ بباتە لوتكەی ئازادی
ئەوساكە بژی بە خۆشیو شادی

[1] ئەم هۆنراوەیە لە دەمی مامۆستا مەلا مەحمووی كزەڵ وەرگیراوە.
[2] ئەم هۆنراوەیە لە دەمی مامۆستا مەلا مەحمووی كزەڵ وەرگیراوە.

# لە وەسفی جوانیت

لە وەسفی جوانیت ئەی یاری دڵدار
ئەم دوو سێ فەردە ئەڵێم بە یادگار
ئەبرۆت بە نەقش سونعی ئیلاهی
کێشراوە وەك تاق، ئیقبالی شاهی
چاوت گەلاوێژ، پریشکە دێنێ
روومەت ئاوێنە، ئینسان ئەنوێنێ
دەم کانی یاقووت، پڕە لە گەوهەر
زوبان شیرینتر لە شەهدو شەکەر
دوو زوڵفی رەشت، هەر وەکو رەشمار
ئاڵاوە لە مل نازگی نازدار
گەردی وەك بلوور، مینایی بێگەرد
شیرین‌و پەسەند وەك ئاڵتونی زەرد
زوڵفت وەك کەمەند نێچیری بەهرام
بۆتە زنجیری دڵەی نابەکام
مەمانت نارنج، یا لیمۆی کاڵە
یاخود شەمامە یان پرتەقاڵە
گۆنات وەکو شەمع، منیش پەروانە
بە حوسنت سووتام، جەرگم بریانە
سینەت بە وێنەی بەفری تازەو تەڕ
ساف‌و بێگەردی وەك بەردی مەڕمەڕ
نافەت عەترڕێز پڕ موشك‌و عەنبەر[٣]
پڕ لە رائیحەو بۆنی موعەتتەر
شەرتە (مەزڵوم)یش لەیلی نازپەروەر!
مەجنونی تۆبێ تا رۆژی مەحشەر

[٣] نافەت: ناووك. موشك: ماددەیەکی بۆنخۆشە لە ناووکی مامزی موشك دێتە دەرێ.

# من و شەیتان

هەر ئەمووت خۆزگە بمدیایە شەیتان
ئیبلیسی لەعین دوژمنی رەحمان
داخی دڵی خۆم پێ بڕشتایە
حەقی بەرو دوام لێیسەندایە
من بەو داخەوە گەلێ مامەوە
بەو حەسرەتەوە ئەتلامەوە
تا ئاخر، شەوێ وەختی نیوەشەو
بە عەزمی نوستن چاوم چووە خەو
دیم لە خەومدا تازە جەوانێ
بە باڵا عەرعەر، شیرین زوبانێ
گەردن وەك شووشەی گوڵاو موعەتتەر
نازكی گۆنای لە گوڵ ناسكتر
بە سەد نەزاكەت هات بەلامەوە
زامار بووم، زامی بۆ كولانمەوە
چاوم هەڵبڕی، دیم چاوی مەستی
خەیلێ بێهۆش بووم كەوتم بە مەستی
وتم: ئەی جوان، تۆ بی جوانی خۆت
پەریت، ئادەمیت، بڵێ ناوی خۆت
تۆ بۆچی وێڵی، بۆچی عەودالی
بۆچی موحتاجی دیوانو ماڵی؟



دەم بە خەندەوە، جوابی دامەوە

یـــەك دوو قـــەدەمێ هـــات بەلامـــەوە
وتـــی: پـــەری نـــیم، ئـــادەمیزادم
وتـــی گوڵچـــینی بـــاغی مـــوردام
مـــن ئـــەو کچـــەم کـــە پـــارو پێـــرار
لـــە عەشـــقی منـــدا لات نـــەبوو قـــەرار
ئێســـتاش بـــە یـــادی جـــاری جارانـــت
خـــۆم بـــە دیـــاری هێنـــا دیوانـــت
بـــۆ فـــەرەحی دڵ بـــۆ خـــەڵوەتی خـــەو[1]
لـــە بـــۆ ســـەیران و رابـــواردنی شـــەو
وتم بـــــەخێربێی قـــــوەتی ئـــــەژنۆم
مەرهـــەمی دەردی زامـــانی بـــە ســـۆم
گـــەلێ مـــەمنون بـــووم ئەزیـــەتت کێشـــا
لـــە بـــۆ دیـــدەنی تەشـــریفت هێنـــا
فەقـــەت تـــۆ نابـــێ گلـــەیی بکـــەی
تەعنـــەی بێمـــەیلی لـــە دڵـــم بـــدەی
مـــن لـــە پـــارەوە قـــەولم کـــردووە
لـــە حـــەرام دوور بم تۆبـــەم کـــردووە
ئێســـتا تـــۆ لـــە مـــن بـــە شـــەرع و قـــانوون
گـــەلێ حـــەرامی بـــە بـــێ چەندوچـــوون
وتـــی: لەوســـاوە لـــە یـــەکبوین جیـــا
هـــەوڵ و تەقـــەلام بـــۆ ئەمشـــەو ئـــەدا
ئێســـتا تـــۆ ئـــەڵێیت، بـــە تـــۆ نـــارازیم
تۆبـــەم کـــردووە، یـــەعنی کـــە ســـۆفیم
ئـــەو قـــەولی خۆتـــە، تـــۆ بـــدە بـــە بـــاد

---

[1] فەرەح: خۆشی. خەڵوەت: تەنیایی.

بێـرە پێشـەوە هەرچـی (بـادا بـاد)![1]
بـە گـەنجی ئەگـەر هەرچـییە بکـەی
گونـاهی کەمـە، چـونکە تـۆ جوانکـەی
بە عـومری جـوانی هـیچ قسـوور مەکـە
هەر وەقتـێ پیربـووی ئەوسـا تەوبـە کـە
موختەسـەر چـاکە هەڵمـەتم بـۆ بـرد
وەك گـورگی برسـی ژێـرەوژووم کـرد
گەلێ سـواری بـووم کێشـامە ژێـر بـار
بـەناز جارجـارێ ئـەیووت ئـەی هـاوار
فاسـیلەم نـەدا تـا وەقتـی سـەحەر
دامە بـەر کـوتو حەملـەی پـڕ هونـەر
ئەمەنـدەم لێـدا بـە حەربـەی چـەرمین
ئەسڵی مەقسەدی گشـت بـوو بـە بـرین
خـوێنو ئـاو جـاری لێئەهاتـە خـوار
وەکـو چـۆڕاوگەی گوێسـیلەی بـەهار
سەرسـەر لاشـەی ئـەو نەوجەوانـە
سـیسو شـێواو بـوو وەکـو هەمانـە
کاتـێ بـەتاڵ بـوو خـەیاڵی سـەیران
هـەواو خۆشـیو شـادی مەعشـوقان
لـەب بـە خەنـدەوە، هاتـە کایـەوە[2]
جـەوابی منـی وەهـا دایـەوە:
من کەی یاری تۆم، کەی بە تـۆ دۆسـتم
مـن بـۆ حـاڵی تـۆ مەینـەتیو کۆسـتم
چـونکە شـەیتانم، دوژمنـی ئـادەم

---

[1] چی ئەبێت با ببێت.
[2] لەب: لێو.

ئەیخەمە عوسیان ئیسلام زۆرو کەم[٣]
ئەمن دوژمنی ئەولادی حەوام
(بەری) لە قاپی رەحمەتی خودام
تۆبەی چەند کەسی وەکو تۆم شکان
چەندە عابدم خستۆتە عوسیان
جوابم دایەوە وتم ئەی شەیتان
قەسەم بە خودای زەمین و ئاسمان
تۆبەم لە جاران زۆر قائیمترە
نوێژو تاعەتم گەلێ چاترە
بۆیە هەر ئەمووت من تۆم بدیایە
تۆڵەی عالەمم لێت بسەندایە
شوکر ئاواتم ئەوا هاتە دی
دوژمنی خۆمم بە سەرشۆڕی دی
یاخوا سەد خێری وەها بێتە رێم
کە دوژمنی خۆم هەر بۆ خۆم بیگێم
ئەلحەمدولیلا لە رۆژی مەیدان
چەند زەربەی کاریم بە دوژمن گەیان
دوژمنم، شەیتان، بۆم هاتە مەیدان
هەر بە دەستی خۆی، خۆی دا بە تڕان
ئەی شەیتان یاخوا زوو بۆم هەڵکەوی
دیسان بەر حەملەی (مەزڵوم) بکەوی

[٣] عوسیان: یاخیبوون، فەرمان جێبەجێ نەکردن.

# فەسڵی بەهارە

فەســـــڵی بـــــەهارە، عــــەزیزم نۆبـــــەتی ســـــەیرانمە
وەقتی عیشوەو نۆشو شادی، زەوقـی دەس لــە ملانمــە
چی لە دڵکەم، ئارەزووی وەسـڵی مـەهرووویان ئـەکا[1]
سـەد جـوانی حـۆریی رووخسـار لــە دیوانـا میوانمــە
من نامەوێ خـەتو خـاڵو نەقشـی رووی دولبـەران
چـونکە خێمـەی گـوڵو نێـرگس مـەنزەری چـاوانمە
قەڵەم کوول بوو، لــە وەسـفی حوسـنی تـازە جوانـان
ئــەمجا نۆبـــەی تۆیـــە، رەقیـــب ئـــارەزووی مەیدانمــە
بەهرەکـەی شـیعرم سـوارە، تیغـی زوبـانم مـوو ئـەکا
گــەر رەقیـبم بێتــە مەیـدان، ئەوسـاکە مـن سـەیرانمە
سواری ئەسپی نالەبارە رەقیب لــە دوور وا غـار ئـەدا
ئەمڕۆ (مـەزلوم) وا لــە سـەبرا موسـابەقەی سـوارانمە

---

[1] مەهروویان: رووی وەك مانگ.

# کچە کورد

کچــە کـــوردێکم زەریــفو هوشــیار
بــۆ کــزی هــۆزم، دڵســۆزو غــەمخوار
بــۆ ژینــی کــوردی گــیروەدەی هــەژار
دنیــام لێبۆتــە شــەوی تــیرەو تــار
ئــارامم نییــە، نـــاگرم قـــەرار



تـاویَ لــە داغــی کــوردی بــەجێماو
دەمــیَ لــە حەســرەت لاوانــی شــێواو
بــۆ حــاڵی ژینــی تــاڵی وەك زووخــاو
ئــازاری قـــەبرم هاتۆتـــە بەرچـــاو
دڵ مەینـــەتبارە دەروون پـــڕ جـــەخار



حەیفــە کــە کــچو بــە کــچ ناســراوم
لــە تــانو پــۆی کــوڕ جیــاواز کــراوم
بـــۆ خزمـــەتکردن بێبـــەش کـــراوم
ســەر دانــێم لــە ڕێــی قــەومی فــەوتاوم
نەقــدی جانیشــم بکــەم فیــداکار[٢]



ئــەوەی، کــە کــوڕو گــەنجو بــەکارە
بـــۆ خزمـــەتکردن دەســـەڵاتدارە
بـــۆ شکســـتێنیَ وا گرفتـــارە
خزمـــەتی هـــۆزی لـــەلا بێگـــارە
دەمـــی بەســـتراوە نایەتـــە گوفتـــار



---

[٢] جان: گیان.

کۆششــی خــەڵکی لــە بەرچــاوانە
ئــەزانی هــەوڵیان کــە بــێ سـامانە
لەســەریان نییــە دەســتی بێگانــە
بۆیــە وڵاتیــان ئــەڵێی جینانــە[1]
وەنەوزی غەفڵەت نادا لــە رووی کـار

☆ ☆ ☆

تکایــە بــرای لاو، چــاکو جــوان
قــۆڵی لێهەڵکــەن وا بێنــە مەیــدان
بــە دڵ تێکۆشــن، ئــازا بێووچــان
بــەڵکو بچــینە ریــزی میللــەتان
ســەربەخۆ بــژین نــەبین دەســتەوخوار

---

[1] جینانە: کۆی (جەننەت)ە، بەهەشت، فیردەوس.

# هاوینی بەرزنجە

تریفـــەی مانگەشـــەو، بریقـــەی کـــڵاوزەر
شـــێوەی مـــەحبوبان، دێتـــە بەرنـــەزەر
ســـەدای لایلایـــەی تـــازە جوانـــان
ئـــەلاوێنێتۆ، دۆســـــتو مەعشـــــوقان
کـــزەی بـــای شـــەماڵ کـــە دێ بـــە جارێ
بـــۆی گوڵـــێ دێنـــێ لـــە باغچـــەی یـــارێ
قاســـپەی نێرەکـــەو وەختـــی نیوەشـــەو
دەنگـــە بـــۆ عاشـــق، راپـــەڕە لـــە خـــەو
جریـــوەی چـــۆلەکەی بـــەیان لـــە ئاسمـــان
بەســـــتە ئـــەخوێنن وەکـــو عاشـــقان
شـــنەی بـــای ســـەحەر ئەشـــنێتەوە
بـــە نـــاز گوڵـــەکان ئەلەرێتـــەوە
بولبـــولی هـــەژار لـــەم چـــڵ بـــۆ ئـــەو چـــڵ
بـــێ پـــەروا ئـــەڕوا لـــەتاو عەشـــقی گـــوڵ
ســـینەو باغچـــەی بـــەی، پـــۆلی نـــازداران
هاوتایـــە لەگـــەڵ ســـپێدەی بـــەیان
گۆنـــای نـــازداران بـــە رەنـــگ ئـــاڵو ســـوور
ســـیوەیل لێیـــداوە، نـــەك ســـووراوی ســـوور
شـــێوەی جـــەوانان بـــە وێنـــەی غیلمـــان
مەملەکەت جەننـــەت هـــەم (رەوزەی ریـــزوان)
نەخشـــاوی ســـنعەت زاتـــی کردگـــار
بـــۆ (مـــەزڵوم) مـــەدحی نایەتـــە گوفتـــار

# کوڕەکاژاو[1]

ئـەی (کوڕەکـاژاو) بـەرزی هـەوادار
ساحێب نـەزارەت بـۆ دەشـتو کۆسـار[2]
سـەربەرزو بڵنـد، گشـت شـاخەکانی
سایەی سـەری گشـت قـەومی کـوردانی
بـە سـەربەرزیی تـۆو چـیای بێسـتون
سـەربەرزن قەنـدیل هـەم پیرەمـەگرون
دەماوەنـد دائـیم سـەنا خوانتـە
عاشـقی قـەدو بـاڵای جوانتـە
بـەردت هەمتایـە لەگـەڵ گەوهـەردا
غوبـارت تەعنـەی لـە سـەد جەوهـەر دا
ئێسـتاکە بۆچـی مـاتو شـێواوی؟
بۆچـی حـەزینو زەرد هەڵگـەڕاوی؟
بۆچـی ئەمەنـدە مـاتو غـەمباری؟
بۆچی ڕەنگ زەردی، بـۆ لێـو بـە باری؟
کـوا شـنەی پـاڵی بـەرەزای پاڵـت!
کـوا خێمـەی گـوڵو گوڵاڵـەی ئاڵـت!
کـوا پـۆلو دەسـتەی تـازە جوانانـت!
کـوا شـەرقیو نەشـید سەراو ئـەیوانت!
کـوا خـوڕەی بـەفراو فەسـڵی بـەهارت!
کـوا دەسـتە دەسـتەی مەحبوبـەو یـارت!
کـوا سـروەی نەسـیم، بـەری بـەیانت!
کـوا نەغمـەی بولبـول دەوری گوڵانـت!

---

[1] کوڕەکاژاو: چیایەکی بەرزە لە شارباژێر (بەرزنجە).
[2] کوهسار: ناوچەی شاخاوی.

مـــن داوا ئەکـــەم کـــۆهی بـــە ســـامان
حـــاڵو ئـــەحواڵی خـــۆت بکـــە بـــەیان
جـــوابی دامـــەوە هـــەر وەکـــو بولبـــول
وتـــی: چـــی ئـــەڵێم بیگـــرە بـــە دڵ
مـــن شـــاخی مەشـــهوور کورەکـــاژاوم
لـــە ئاســـتی دوژمـــن لارە کـــلاوم
مـــن جێگـــای مـــەردو پاڵـــەوانانم
هـــەم بێشـــەی گـــوردو شـــێری ژیـــانم
فەســـڵی بـــەهاران بـــە خێمـــەی گـــوڵان
ئەڕازامـــەوە هـــەر وەکـــو ڕێـــزوان
چـــەند چـــەشمەی ئـــاوی ســـازگارم بـــوو
چەند بـاغو باخچـەی پـڕ لـە کـارم بـوو
وەختـێ گـوڵزاری خـۆم ئـەدی بـە چـەم
سـەد تەعنـەم ئـەدا لـە (بـاغی ئـیرەم)
پـۆلی نـازداران نـازك نـەو خـاڵان
رووەمەت پەڕەی گـوڵ، قامـەت شمشـاڵان
بـە عیشـوەو نـازو لەنجـەولارەوە
بـە چـاوی مەسـتی پـڕ خومـارەوە
ئـەهاتن بـۆ لام بـە عـەزمی سـەیران
ئـەمن جەنـەت بـووم، ئـەوانیش غیلمـان
چـەند زاتـی مەشـهوور قـەدیمی رۆژگـار
ئـەهاتن بـۆ لام بـە عـەزمی شـکار
رۆژێ لـە رۆژان نیگـام کـرد بـۆ دوور
دیم گـەردەلوولێ لـە رووی شارەزوور
دنیـا سەراسـەر بـووە بـە زوڵمـات
ئـەهالی غـەمگین حـەزینو دڵ مـات

پرسیم لـــە کەســێ بــە کــوردی زوبــان
ئــەم غــەوغا چــییە، بــۆم بکــە بــەیان
دنیــا سەراســەر بــۆ لــە گرینــە
بۆچــی مــەخلوقات دڵ پــڕ برینــە؟
لــەم خاکــە پاکــە چــییە قــەوماوە
دووربــێ فیتنەیــە، کەوتــە دنیــاوە؟
جــوابی دامــەوە بــە دڵــی پــڕ جــۆش
بــە گریــەو زاری بــە شــینو خــرۆش
حــاڵو ئــەحواڵی بــۆ کــردم بــەیان
ئەســڵی مەســئەلەی لا کــردم عــەیان
وەقتــێ کــە بیســتم رۆژی رەشــی کــورد[1]
هاتمــە جــەنبوش، هــەتا شــەقم بــرد
کــردم بــە ســەرما خــاکی بــێ شمــار
یەخــەی خــۆم دری لــە ســەرتابەخوار
بــاغو باغچــەی گــوڵ کەوتنــە خــەزان
ناڵــەی بولبــولان گەیشــت بــە ئاسمــان
ئەمەنــدە گریــام کێشــام بــە ســەردا
وەك بــاوك مــردە بــانگم لــێ بــەردا
یــاخوا دەردی وا خــوا نەیــدا بــە کــەس
وەکو دای بە کــورد (مــەزڵوم)ی بێکــەس

---

[1] مەبەست لە تێکچوونی کۆماری کوردستان لە مەهاباد.

# سکالا لە خزمەت یارا

یــــاری وەفــــادار، یــــاری وەفــــادار
نــــازك‌و نــــازدار، یــــاری وەفــــادار
لـە هیجرانی تۆ بـووم بـە کـۆی زوخـاڵ
نـەمکرد سـەیرانی گۆنـاو خـەت‌و خـاڵ
عەهـدە کردوومـە هـەر وەکـو فـەرهاد
لە کۆی عەشـقی تـۆ خـۆ بکـەم بـەرباد
هـەر کاتـێ شـاد بـووم بـە دیـداری تـۆ
بـووم بـە خـاوەنی خـەت‌و خـاڵی تـۆ
لام مەتڵـــەب نییـــە تەعنـــەی رەقیبـــان
گوێ نادەم بە پەنـد، واعیـزو خویشـان[٢]
دەوڵـــەتی وەســـڵت بـــۆ مـــن کافییـــە
تـــاجی کەیخوســـرەو لام بـــەهای نییـــە
گـــەنج‌و ئیقبـــاڵم دانـــەی خـــاڵی تـــۆ
چـــرای دیـــوانم چـــاوی کـــاڵی تـــۆ
خـــوردو خـــۆراکم ماچـــی کـــوڵمی تـــۆ
شیشـــەی شـــەرابم ســـای گـــەردنی تـــۆ
مەعبەدخانەکـــــەم خەڵوەتخانـــــەی تـــــۆ
قیبلـــەگای ســـوجدەم میحرابـــی ئـــەبرۆ
تـــەوافی کەعبـــەم وەســـڵی دیـــدارت
(حەجەرلئەسـوەد) خـاڵی رووخسـارت

[٢] واعیز: ئەوەی نەسیحەت دەکا.

تـای عـودو تـارم دوو زوڵفـی خـاوت
سەرخۆشـی کـردم مەیخانـەی چـاوت
مێـزی شـەرابم سـینەی مەڕمـەڕت
مـەزەی شـەرابم دوو لیمـۆی تـەڕت
عـەرەق و بـیرەم ماچـی کـوڵمی تـۆ
سـاقی و پیاڵـەم چـاوی گەشـی تـۆ
دەم دەم ئەنۆشـم شـەرابی گۆنـات
دوو لیمـۆی کاڵـت، بـۆ مـەزە هێنـات
مەسـتی دوو چـاوی (عاشـقکوژی) تـۆم
جگـەر لەتلـەتی غـەمزەو نـازی تـۆم
چـاوت هـەڵبڕە، بزانـە مـن کـێم
ئـەمن مـەجنونی دوو چـاوی لـەیلێم
ئەسـیرم بـە دەس رەقیبانـەوە
هـەم بـە دەس دڵـەی ماڵوێرانـەوە
دەردم وەهایـە لـەیلی نازپـەروەر!
نزیکـە دەرچـم لـە پێسـتی بەشـەر
ئیـتر کۆتـایی کـەلامم نایـە
رەنگ زەردی عەشقم، شیفام قـەت نایـە
(مەزڵوم) وەك مـەجنون پیشـەی زارییـە
خولیـای عاشـقی بـێ قەرارییـە

# کام ویژدان

کام دین، کـام ئیمـان، کامیـان ویژدانـە
ئـاخۆ کـام ئینسـان ئەمـەی لا جوانـە
گـەرماو شـەرارەی هـەتاوی بـەتین
خـوێنم کـا بـە ئـاو، هێـزم کـا بـێ تـین
هەوڵبـەم بـە دڵ بـە درێـژی سـاڵ
بـە سـەرماو گـەرما بـۆ ئیـدارەی مـاڵ
بـە سـاڵێ بـەحاڵ شـتێك پەیاکـەم
لـە مـردن کۆشـێ خێـزان رزگارکـەم
کـاتی حاسـیلات، بـێ شـەرمو بێبـاك
لێم کـۆ ئەبنـەوە وەك داڵ بـۆ سـەرلاك
بـێ عـەرەق رشـتن، یـان رەنجی بـازوو
خەرمان بەش ئەکەن، سـەهل زووبـەزوو
بەشـی موڵکانـەی: ئاغـا، شـێخ، مـەلا
لە چوار بـەش بێشـك سـێ بەشـی ئـەبا
ئینجـا چـی مـاوە بـۆ مەسـروفی مـاڵ
بـۆ جـلو بـەرگو پـێڵاوی منـاڵ
ئـاهو هەناسـەی ئـەم گشـت خێزانـە
بچـێتە ملـی ئـەو ملهوڕانـە
(مـەزلوم) تـا شـێخو ئاغـا لـەناوبێ
لـە کوردسـتانا ئـازادی نابـێ[1]

---

[1] ئـەم هۆنراوەیـە لـە مەلیحـەخانی خێزانـی شـاعیر بیسـتراوەو شـێخ عومـەری کـوڕی شـاعیر نووسیویەتیەوە.

# خەفەت دڵمی برژان

خەفــەت دڵمـــی بـــرژان وەك کـــەباب
جەرگم لەتلەت بـوو وەك گۆشـتی قەسـاب
درا لـــە شـــیش و بـــرژا بـــە ئـــاگر
بـــۆ مـــەزەی شـــەراب ئـــەوەڵ و ئـــاخر
ســـەبرو تاقـــەتم لـــە دڵا نـــەما
پـــردی تەحـــەمول لـــە ســـەد لا پســـا
لـــە رووی ســـەر زەمـــین فیعلـــی ناشـــیرین
ئەمەنـــدەم دیـــوە نایەتـــە نووســـین
عـەرەقخۆر دائیم، پیاڵـەی مـەی بەدەسـت
بـێ پـەروا ئـەیخوارد رووسـیای بەدبـەخت
ناترســـێ لـــە رۆژ دیـــوانی مەحشـــەر
قـــەت خـــۆفی خـــوای نایەتـــە نـــەزەر
قەشمـــەری بـــە نوێـــژ، گاڵتـــە بـــە رۆژوو
ئیســـتیهزا بـــە حـــەج، زەکـــات و مـــەولوو[1]
عـــەرەق خـــواردنی ئەمەنـــد لا جوانـــە
قـــاپێکی بـــە دەس، دووی لـــە گیرفانـــە
بـــۆ خـــۆی زەرەرو بـــەڵا ئەســـێنێ
هـــەر بـــە دەســـتی خـــۆی دیـــن ئـــەدۆڕێنێ
لـــە حـــاڵی مـــردن گـــەڵێ بێحـــاڵن
تـــاڵبی هـــەواو نـــەفس و خـــەیاڵن

---

[1] ئیستیهزا: گاڵتەپێکردن.

خوایــــە تــــۆ خــــۆت فعلیــــان ئــــەبینی
غــــەزەبت بۆچــــی بــــە جــــۆش نایــــەنی
لــــە دونیــــا لــــە مــــن عاســــیتر نییــــە
باســــی خــــەڵق ئەکــــەم خــــۆم لــــەبیر نییــــە
(مــــەزڵوم) گونــــاهی خــــۆم ئەکــــەم ئیقــــرار
تەڵــــەبی عــــەفوو ئەکــــەم لــــە ســــەتار

# مەرحەبا پارە

مەرحـــەبا پـــارە، مەرهـــەمی زامـــم
فـــەرەحی قـــەلب‌و دڵـــەی ناکـــامم
پـــارە، بـــە تۆیـــە قـــووەتی ئـــەژنۆم
ئـــەتۆ دەرمـــانی بـــۆ زامـــی بەســـۆم
پـــارە گریکـــی دڵـــی وێرانـــی
واســـیتەی روونـــی هـــەردوو چـــاوانی
ئـــەتۆ چـــاتری لـــە بـــراو بـــاوك
هـــەر ئـــەتۆی پـــارە، پریاســـکەی نـــاوك
بـــۆ تۆیـــە بـــرا بـــرا ئـــەكوژێ
لـــە رووی مەیـــدانا خـــوێنی ئـــەڕژێ
بـۆ تۆیـە دەوڵـەت حـەرب ئـەكا ئـیعلان
حـەیات تـەرك ئـەكا ئـەبووریّ لـە گیـان
كاســـبان بـــۆ تـــۆ رۆژ هـــەتا ئێـــوار
هـەوڵت بـۆ ئـەدەن لـە لادێ‌و لـە شـار
بـۆ تۆیـە جـەردە كـە رێگـە ئـەگرێ
بـە گوللـە، جـەرگی رێبـواران ئـەبڕێ
بـــۆ تۆیـــە كـــە ژن حـــەیا ئەفرۆشـــێ
خـــۆی مـــەهتوك ئـــەكا لـــە بـــۆ قرۆشـــێ
پـــارە لـــە دونیـــا، هـــەر تـــۆ ئـــەنوێنێ
هەر وەكـو بولبـول سەربەسـت ئـەخوێنێ
پـــارە چـــەند پیـــاوی نـــەفام‌و هـــەرزە
بە تۆ بوو بە پیاو زیاد بـەم نـەوع‌و تـەرزە
چەند مـەردو عـاقڵ بـە بێ دەردی سـەر
دێنـــە خزمـــەتی ئـــەبن بـــە نۆكـــەر
چەند كەسی ناكەس تـۆ كـردت بـە پیـاو

کــــردت بـــە خـــاوەن دیـــوانی تـــەواو
بــە بــێ تــۆ پــارە چــەند ســاحێب وەجــاغ
مـــاتو غەمگینـــە دەروون پـــڕ لـــە داغ
تـــەنها خــــەمڕەوێن جــــەنابی ئەمـــە
بــێ پـــارە بەشـــی هــەر جــەفاو غەمـــە
هیچ کەس ناپرســێ لــە ســاحێب نەســەب
لە قــەدرو حورمــەت لــە حــەیاو ئــەدەب
مــــەلای بێچــــارە کـــە لێـــی ئەپرســـێ
هـــەزار یاســـینو تـــەلقین بـــە فلســـێ
کێ بــە شــێخ ئــەڵێ لــە کوێــوە هــاتووی
دەروێش بە پولێ ســەد زیکــری یــاهووی
غـــەیری پــــارەدار هـــەمووی بەتاڵـــە
کـــێ مــەلاو شــێخی هــەر لــە خەیاڵــە
هەرکــەس پارەی بــوو ئــەو کەســە پیــاوە
دێنـــە خزمـــەتی لــــەملاو لـــەولاوە
ئەگــــەر پـــــارەدار لـــــە فـــــەقیر بـــــدا
ڕەزیلــــــی بکــــا تەعنــــەی لێـــــدا
گــــەلێ پێـــی خۆشـــە زۆر منـــەتبارە
لای نەســــــیحەتەو فــــــەقیر بێچــــــارە
پێـــی ئـــەڵێ حەقتـــە هەرچـــیم پێبکـــەیت
لام نەســـیحەتە هەرچـــیم پـــێ بڵێیـــت
(مــــەزڵوم) بزانـــە پـــارە بـــۆ دونیـــا
چــەند فــەزڵو هونــەر بــە ئینســان ئــەدا

# بۆ پارە

بـۆ پـارە گـەلێ خـۆی ریسـوا ئـەکا
موبتـەلای داوو سـەد بـەڵا ئـەکا
بـەیانی کـردووە پیاوچـاکانی زوو
دینتـان دینـارەو سـڵ ناکـەن لـە سوو
پارەیـە مایـەی سـەرگەردا نییـە
هـەر پـارە ئەسـڵی ماڵوێرانییـە
کەسـێ کـە پـارەی هـەبێ بـە غـەزەب
دینـی بـە پـارە ئـەدا بـێ تەعـەب[1]
هەرکـەس دینـی خـۆی بـە سـیمو زەڕ دا
خـۆی خسـتە دۆزەخ، سـەرکا بـە قـوڕدا
هـەر پـارە ئینسـان ئەخاتـە عیسـیان[2]
تـەوەللای ئـەکا لـە دیـنو ئیمـان
پـارە چـەند کەسـی کـردووە مـەغروور
وەکـو دێوانـە بـە مەسـتی مەشـهوور
قـارون بـە پـارە (تەککـەبووری) کـرد[3]
خۆی ریسوای لای خواو پێغەمبـەری کـرد
کەسـێ ئینسـان بـێ لـە بـۆ سـیمو زەڕ
خـۆی رووزەرد ناکـا لـە رۆژی مەحشـەر
پێغەمبـەر بـۆ خـۆی داوێتـی خەبـەر
پـارە فیتنەیـە بـۆ حـاڵی بەشـەر
(مـەزڵوم) زەڕو سـیم خـاس بـۆ ژنانـە
سـوكو بـێ بـەهای لای مەردومانـە

---

[1] تەعەب: هیلاكو ماندوو. [2] عیسیان: تاوانو گوناهکردن.
[3] کابرایەکی دەوڵەمەندی بەنی ئیسرائیلە، لە سەردەمی حەزرەتی موسادا ژیاوە. موسا نەفرەتی لێکردو کابرا خۆیو خەزێنەکانی بە ناخی زەویدا چوونە خوارەوە، کینایەتە بۆ دەوڵەمەندی.

# هەڵۆو ڕێوی

تـــەیرێکی عـــاقڵ زیرەکـــی هوشـــیار
خـــانووی کردبـــوو لەســـەر یـــەك چـــنار
بـــە عـــەیش‌و شـــادی بـــە خۆشـــی ژیـــان
لەســـەر ئـــەو دارە کـــردی (ئاشـــیان)[٢]
ڕۆژێ لـــــە ڕۆژان ڕێـــــویی حیلـــــەکار
ڕێـــڕەو بـــوو ڕێگـــەی کەوتـــە بنـــی دار
ســـاتێ ڕاوەســـتا لـــــووتی هـــەڵبڕی
لەســـــەر دارەکـــــە تەیرەکـــــە فـــــڕی
بـــانگی کـــرد ئـــەی تـــەیر لـــەو دارە بـــەرزە
بێـــرە خـــوارەوە بـــۆ ســـەر ئـــەم عـــەرزە
ئەگـــەر بـــە قســـەم قەناعـــەت نەکـــەیت
هەر بە دەستی خۆت، خۆت ریسـوا ئەکـەیت
بـــە کلکـــی تیـــژو ئەســـتووری زۆردار
دار لـــەت لـــەت ئەکـــەم هـــەروەکو مشـــار
کاتـــێ کـــە دارم کـــرد پـــارە پـــارە
مـــەردو نامـــەردی ئـــەو وەختـــە دیـــارە
بـــێ ســـزاو زەرەر هـــەر بـــە دەســـتی خـــۆم
کـــەوڵت ئەکـــەم‌و بـــە ژەمێـــك ئـــەتخۆم

★ ★ ★

هـــەڵۆی خـــڕو جـــوان لێـــی هاتـــە گوفتـــار
وتـــی: مـــام ڕێـــوی جـــادووی حیلـــەکار

---

[٢] ئاشیان: هێلانە.

سـيحرى تـۆ مـەعلوم لاى مـن بەتاڵـە
عـەقڵت عەبەسـە، فيكـرت مەحاڵـە
بـڕۆ لـە ڕێـى خـۆت خـوا ڕزقـت بـدات
مـن نێچـيرت نـيم مـەعلوم بـێ لـەلات
هـەڵۆ زۆر ڕجـاو تەشەبووسـى كـرد
لـە لاى مـام ڕێـوى تەئسـيرى نـەكرد
بـە قـەهرو غـەزەب لەسـەر دار فـڕى
سـوارى ڕێـوى بـوو تـا ورگـى دڕى
ڕێـوى كـرد پـارە، وەك شـێرى جـەنگى
جـەرگى دەرهێنـا بـە زۆرى چـنگى

☆ ☆ ☆

ڕێـوى بـۆ تـەماع وازى نـەهێنا
نـە هيچـى دەستكەوت، سەريشـى دانـا
ئـاخ لـە بـۆ كەسـێ نەچـێ بـە قـارا
لەگـەڵ دوژمنـا بكـا مـودارا
تـاكو فرسـەتێ دەسـكەوێ ڕۆژێ
يەخـەى پێبگـرێو خـوێنى بڕێـژێ

# حەبی تەباشیر شرینقەی قەڵەم[1]

بــرا نەخۆشــیو دەردی نــەزانی،
نــەزانی، بۆیــە بــە خــۆت نــازانی
جــــەهل دەردێکــــی نادیارییــــە
فریــای نەکــەوی دەردت کارییــە
داوو دەرمــــانی ئــــەم دەردە ونــــە
زانینــی عیلمــە هــەوڵی خوێندنــە
بچــۆرە مەکتــەب (دارولشــیفایە)
موعــەللیم دکتــۆر دەوای لەلایــە
حــەبی تەباشــیر، شــرینقەی قەڵــەم
ئەبێتــە شــیفای ئــازارو ئەلــەم
ئــەو کتێبانــەی لــە بەردەســتتایە
ڕەچــەتەیە کــە دەوای تــۆی تیایــە
ئەجزاخانەیــە هــۆدەی دەرســخانە
پــڕ لــە دەرمــانی دەردی نەزانــە
لەو ئەجزاخانە گــەر دەوات ئــەوێ
ســەعیکە هــەتا دەســتت ئەکــەوێ
بــۆ تێکۆشــینە ئەفــەرمووێ خــودا
(لــیس للانســان الا مــا ســعی)

---

[1] لــە دیوانەکەیــدا نەنووســراوە، کــاك فەرەیــدونی حــاجی کــەریمو شــێخ عومــەری کــوڕی شــاعیر لەبەریانەو نووسیویانەتەوە.

# چای خواردن

کـــوردە دەخیلـــە دەســـتم بـــە دامـــان
(ســـەماوەرە زەرد) بهێنـــە مەیـــدان
ئـــاگری تێکـــە بـــا بێتـــە خـــرۆش
بـــە وێنـــەی دڵـــی عاشـــق بێتـــە جـــۆش
زیـــرەی ســـەماوەر بـــە گـــوێ ببیســـم
بـــە ئیزنـــی خـــوا لـــە دەرد ناترســـم
نەخۆشـــی راســـتە بـــە دەس خوایـــە
چـــایش وەك مـــەولود دەفعـــی بەڵایـــە
قۆریـــەی رووســـی، پیاڵـــەی ژاپـــانی
شـــەکری بـــەلجیکا، چـــایی ســـیلانی
هـــەمووی حازرکـــە لـــە دیوەخانـــت
بـــا شـــادمان بـــێ ئـــەهلی دیوانـــت
بـــۆ ئـــەهلی مـــەجلیس تێکـــە پـــەیا پـــەی
بـــە یـــادی دەوران (کـــە یـــا نـــانی کـــەی)
ئەگـــەر خوداوەنـــد مـــاڵی داوێتـــێ
پـــارەو حـــەیوانو حـــاڵی داوێتـــێ
بـــۆ تـــۆ چـــا خـــواردن ئـــەخلاقی پاکـــە
(نـــور لەســـەر نـــورە) وەك ئیحســـان چاکە
خوای گەورە بۆ خۆی بـۆی کـردووین بـەیان
ئـــەموالو ئـــەولاد زینـــەتی دونیـــان
مـــادام وەهایـــە وەك زەخـــیرەی مـــاڵ
شەکرو چای ئـەوێ هەرکـەس بـە پێـی حـاڵ
بـــرا ئـــەزانی شـــەکرو چـــا بـــاوە

ئاوماڵــــت ئـــەیخوا لـــەملاو لـــەولاوە
ئەگـــەر میوانــێ رووی کـــردە ماڵـــت
شەکرو چات نەبێ، گـوی سـەگ بـە حاڵـت
مـــەڵێ قـــەدیمی زەمـــانی پێشـــوو
لـــە مـــاڵی شـێخو ئاغـــا چـــا نـــەبوو
یـــاخود لـــە بـــاوو بـــاپیرم پرســـی
شـــەکرو چـــا ئەســـڵەن نـــەبووە باســـی
مـــەڵێ مـــن نـــایخۆم نایـــە بـــە ماڵمـــا
ســـیرەتی بابـــە بـــۆ مـــن بـــەجێما
منـــیش کاکـــە گیـــان تەســـدیقی ئەکـــەم
بـــاوو بـــاپیرت چـــای نـــەکردە دەم
کـــەی لـــە زەمـــانی ئـــەوان بـــرا گیـــان
رێگـــای تیجـــارەت بـــووە وەك ئـــەلئان
بـــۆی بێنـــە پێشـــێ ئـــەنواعی تـــەعام
بـــۆت نـــەکرد چـــایی نـــاگری ئـــارام
کـــێ دێ ئوتومبیـــل بـــە فـــەردەو بـــە بـــار
شـــەکرو چـــا بێنـــێ لـــەم شـــار بـــۆ ئـــەو شـــار
کـــەی بیســـتویانە بـــە شـــەمەندەفەر
بێتـــە شـــارەکان ئـــەنواعی شـــەکەر
پاپۆڕیـــان کـــەی دی تیجـــارەت بکـــا
بـــە نـــاو بـــەحرا بـــێ بـــازاڕت پـــڕ کـــا
ســـەنعەتی قـــەدیم کـــەی ئـــاوا بـــووە
ســـەروەتی ئێســـتا کـــەی ئەوســـا بـــووە
کاکـــە ســـەروەتی زەمـــانی پێشـــوو

دەوڵـــەتی ماڵـــێ: بزنـــێ یـــا دوو بـــوو
ئەگـــەر خـــۆ ماڵـــێ جووتـــێ گـــای بوایـــە
ئـــەوە مـــەزن بـــوو چـــونکە فەلایـــە
ئێســـتا کـــام کـــەس ئـــەڵێی فـــەقیرە
ســـاحێب ســـەروەتو تـــەختو ســـەریرە
هـــەموو ســـاحێبی پـــارەو مەعاشـــن
خـــاوەنی دەزگـــاو دیـــوانی باشـــن
هەرکـــەس بـــە نـــەوعێ کەســـابەت ئـــەکا
لەگـــەڵ ســـەڵتەنەت شـــەکرو چـــا ئـــەخوا
خـــەڵقی قـــەدیمی کـــەی لـــە مەیدانـــە
(ئـــەو نانـــە نانـــە ئـــەمڕۆ لـــە خوانـــە)
(مـــەزڵوم) ئەگـــەر تـــۆ وەکـــو ئـــەوان بـــی
نامـــەی ڕەزیلـــی بـــۆ خـــۆت ئەنووســـی

# راوی نیٚچیریٚ

رۆژیٚ بــە عــەزمی شــکاری نیٚچــیر
کردمــە شــانم تفــەنگی پیٚــنج تــیر
خەریتــەو چــەتاڵ ئەســبابی شــکار
پۆشــام بــە بــاڵا لــە ســەرتابەخوار
چــوومە شــکارگای جــاری جــارانم
خــۆم خســتە حەشــار بــۆ نیٚچــیرانم
لــە ناکــاو گورگــیٚ ریٚگــەی لیٚگــرتم
بــە قەســدی خــواردن یەخــەی پیٚگــرتم
دەســتم لــە کــاردا هەڵمــەتم بــۆ بــرد
دوو ســیٚ فیشــەکم بــۆ رەوانــە کــرد
بــە زۆری گوللــە گــورگم کــرد هــیلاك
میٚشکی تیٚکەڵ بوو لەگــەڵ خــویٚنو خــاك
کــە دیــم بیٚچــوەکەی خــەیاڵیٚ غەمگینــە
لــە داغــی بــابی دڵ پــڕ برینــە
دڵــم نــەیهیٚنا بیٚچــولەی هــەژار
هــەر وەکــو بــابی بکــەم گرفتــار
هیٚنامــەوە مــاڵ بــە کەشــكو پــەنیر
بــە گۆشــتی بــرژاو بــە قــەیماغو شــیر
پــەروەردەم ئــەکرد بــیٚ ســزاو زەرەر
تــاوەکو بــابی بــوو بــە هەڵمەتبــەر
نــازانم داغــی کوشــتنی بــابی
لــە دڵیــا مــاوەو هــەروا لــە یــادی
لــە بــۆ حــەقی خــۆی وا فرســەت بینــە

بـۆ قەسـاس سـەندن هـەر لـە کەمینـە
ناغـــافڵ وەك مـــار ئـــاڵا لـــە رانم
پـــڕ دەمـــی بـــڕی لـــە گۆشـــتی گیـــانم
ئاخ لـە بۆ کەسێ دەسـی کـەوت دوژمـن
رەگو رەچـــڵەکی دەربێنـــی لـــە بـــن
گـــەورە نـــەکوژیو بچـــووك جێبێڵـــێ
بـــێ بـــە ئـــاگر بـــەربێ لـــە خێڵـــێ

# جەژنە پیرۆزە

جەژنم غەمە، یاخود ئەسەف، بادەم تاڵە وەك زەهری مار
تەن سوختەو دڵ حەزینم لە فیرقەتی یارو دیار
تەن زامدارو دڵ سپێرم لە بۆ تەعنەی رەقیبانم
کونکون بووە جەرگ‌و دڵم، هەر وەکو نەی ئەکا هاوار
لە راستیدا من کەسێکم لە ناو ئۆردووی دەردو غەما
فەقەت ئەمڕۆ بەرزە شانم فەریق‌و سپەهـ سالار
ئەوسافی خۆم گەر بەیان کەم لە بۆ ئێوە بە موختەسەر
گەهـ فاعیل‌و گەهـ عامیلم، گاهی جامباز لە ناوی شار
غەمم زۆرە، غەمی ئێوەش کە بێ مەیلن بۆتە سەربار
خوایە دووربن لە موسیبەت، هەم لە بەلای رەبی ستار
دائم ئەڵێم بە رۆژو شەو (أسعد الله أیامکم)
موبارەك بێ لە بۆ ئێوە جەژنی ئەمساڵ هەر وەکو پار
با (مەزڵوم)یش لە غوربەتا جەژنی غەم بێ‌و خۆراکی دەرد
بێ بەهرە بێ لە دیدارتان هەتا رۆژی دیوانی کار

# سەلاحەدین

سـەلاحەدینی ئـەیوبی لەقـەب
ئیفتیخارمانـە ئـەی کـوردی حەسـەب
سـوڵتانە ئـەمڕۆ قـەهرەمانی کـورد
یەعنی شێخ مـەحمود حسـێنی نەسـەب
یەکسـەر تێکۆشـن بـرای هاوزبـان
لـە بـۆ ئیتیحـاد بـە رۆژو بـە شـەب
کـوردە دەخیلـە شـێرانە دەسـتوور
بۆ دەفعـی جـەهل عـیلم کـەن تەڵـەب
کاسەی مەعریفـەت پـڕو لێـوان کـەن
هـەموو بنۆشـن یەکسـەر (لەبالـەب)
سەربەستیو جەسـوور ئیرسـی خۆمانـە
بۆمـان بـەجێما لـە ئەجـدادو (ئـەب)
ئەم ئیرسەی کوردە با نەدەین بـە کـەس
نـەبێ بـە مایـەی خەفـەتو غـەزەب
ئیلتیمـاس ئـەکا (مـەزڵوم)ی فـەقیر
ئـەم نەسـیحەتە فێـر بـن لـە مەکتـەب

# دنیاو چەرخ

ڕووم لـــە تۆیــە، گــوێڕاگرە، بــۆت بەیانکــەم ماجــەرای دڵ
هەرچـــی ئــەڵێم عــاجز مەبــە، بــا داغــی خــۆم نەبەمــە گــڵ
ئاگرت تێچـێ جیهــان! ڕەببـی گــەردنت شـکێ بـۆ کـردەوەت
تـــۆی مەنبـــەعی فســـق و فەســـاد، تـــۆی ئالـــەتی زوڵـــم و قـــەتڵ
شـــاخی بـــەرزت دەبـــێ دەربـــێ بـــە دەم ســـزاو نەگبەتـــەوە
تــەخت و بــەختت ســەرنگون بـێ، تـا قیامــەت ببــی خەجــەڵ
من بــە هــەدەر لۆمــەت ئەکــەم، بــە بـێ سـوودە تەعنــە ئــەدەم
هەرچــی بکــەی عــەیب نییــە، باکــت نییــە لــە تەعنــەی گــەل
بـــێ ئوســـوڵە ئیشـــوکارت، بـــێ مەتڵەبـــە گـــیرو دارت
بە کەر ئەدەی تەوقەی زێڕین، لە سەگ ئەکەی حیلەی غــەزەل
وەکــو شــەیتان تــۆ لــە ڕێگــە دەرئەکــەی منــداڵی خــەڵقی
نــانی بــاوکی خــۆی نــەدیوە، دنیــات دایــە خەزنــە لــە گــەل
وەکــو تاســی حــەمام وایتــە، وەفــات بـۆ کــەس نییــە تـا ســەر
تاڵبانـــت بـــە داغ ئـــەمرن (مونکیرانـــت) عـــەدوون بـــە دڵ
غــەیری (مــەزڵوم) هــەموو عالــەم بـۆ وەســڵی تـۆ خرۆشــاوە
بە دەس سیحرو جــادووی تـۆوە بیریــان چــووە دەردی ئەجــەل

# ئامۆژگاری

ئـەم نەسـیحەتەم نووسـی لـە دەفتـەر
بیگـرە لـە گـوێ، هـەم بیکـە لەبـەر
پەنـدێکی نـافیع سـاحێب سـەوابە
ڕێنمـای خێـرو چـاکەو حیسـابە
ڕۆڵـە پێـت ئـەڵێم چـاکو خـۆش خووبـە
شـیرین کـەلام بـە گەشـاوە ڕووبـە
ڕووخۆش بە چاکە لەگەڵ هـەموو کـەس
لەگـەڵ غـەریبو فـەقیرو بێکـەس
ڕەحـم بـە هـەتیو، ئـەدەب لـە گـەورە
بچـووك دڵ خۆشـکە هـەر ئـەوە خێـرە
مـوکرم بـە ڕۆڵـە بـۆ خـۆت بفامـە
ڕەحـمو دڵـت بـوو، عـەقڵت تەمامـە
ئەگـەر تـاڵیبی نـەبی بـە ناکـەس
تـەوازع بکـە لەگـەڵ هـەموو کـەس
فەرموودەی حەزرەت شاهی (لەولاکـە)[1]
جـەزای خراپـە بـدە بـە چـاکە
لەگـەڵ هاودینـا یـەك دڵو ڕەنگبـە
لەگـەڵ بـێ عـەقڵ کەمـدوو بێدەنگبـە
لـە ڕەفاقـەتی هـەرزەو هـەرزەکار

---

[1] ئاماژەیە بەو فەرموودەیەی کە دەڵێت: لولاك لولاك لما خلقت الافلاك.

دووربــە عــەزیزم زینهــار ســەد زینهــار
بــۆ پەیــدابوونی دوژمــن مەکۆشــە
دۆســت پەیــدا بکــە ســڕیان بپۆشــە
خــولقی قەناعــەت شــیرین‌و بــەرزە
قەناعــە بکــە مەبــە بــە هــەرزە
کەســێ ئینســان بــێ تەکــەبوور ناکــا
هــەروەکو شــەیتان خــۆی مــەغروور ناکــا
خــۆت دەنــی مەکــە، مەبــە بــە دووڕوو
هــەر وەکــو مەگــەز مەنیشــە لــە گــوو
ئەگــەر وەعــدەت دا ئــەبێ وەفــات بــێ
راســتگۆ بــە دائــیم ســەیرو ســەفات بــێ
بــە چــاوی ســووکی مەڕوانــە فــەقیر
فــەقیر خــۆی نــادا بــە هــەزار ئــەمیر
دنیــای بــێ بــەقا، زۆر بێوەفایــە
هــەر رۆژ بــۆ کەســێ ئەچــێتە کایــە
زۆر بــە تاعــەت بــەو دەروونــت پــاك بــێ
نەزەر قەت مەکــە، چــاوت روونــاك بــێ[٢]
رۆڵــە ئــەمین بــە خیانــەت مەکــە
ئیســلام بــە، تــەرکی دیانــەت مەکــە
لــە رووی بــاب‌و داك بــێ ئــەدەب نــەبی
بــا لــە ئــاخیرەت موعــەززەب نــەبی
قــەدری ئوســتادت فــرە بزانــە

[٢] نەزەر: تەماشاکردنی مێینەی غەیری خوشك بە نیازی سێکسی.

بێ ئەدەب نەبی ئەخلاقت جوانە
رەزیلی مەکە زینهار سەد زینهار
ئینسانی رەزیل قەت نەگری بە یار
سەخاوەت بکە چەندت تاقەتە
سەخاوەت تۆشەی رێی قیامەتە
سنعاتێ عەزیزا بزانە چاکە
ویجدانت بێ کردەوەت پاکە
رووخۆش بە دائیم فەرەح لە دڵ بە
لە رووی خەڵقا هەر وەکو گوڵ بە
ئیکرامت بێ لەگەڵ میوانت
لەگەڵ دراوسێو ئەهلی دیوانت

# لە بەحری میحنەت و غەمدا

لــە بــەحری میحنــەتو غەمــدا، هــەموو عالــەم پەرێشــانە
لــە شــومی جــەوری گەردوونــە کــەوا پامــاڵی وێرانــە
ئەبــەد شــەرمی گلەمەنــدی لــە چــەرخی ئاسمــان ناکــەم
لــە جێــی دانــا، دەنــی دانــا، لــە هــەوڵی شۆڕشو شــانە
زەمانــە دون پەســەندە، گشــت بــە داغــی سینە ســوتاوە
بوزورگــانی کــەرەم پیشــە، بــە یــەك دەفعــە پەرێشــانە[1]
زەمــانی نامــەوەر، ئــەمڕۆ لــە تەنگیــدا خــەریك مــاوە
وەکو هەورێ بە دەم (صرصر) شێواوی حوکمی یەزدانــە
خــیلافو تــەرکی عاداتــە وەکــو مــەجنون لــە دونیــادا
بکــەم زاری هــەتا وەقتــێ کــە حەشــری جنو ئینســانە
لە دەس جەوری فەلەك ئاگر لــە خــەرمانی دڵــم بــەربوو
خاکی عالەم بە سەر (مەزلۆم) کە غەرقی دەردو هیجرانــە

[1] بوزرگان: گەورەو هەڵکەوتووان.

# کەرە دێز

مایــەی نۆمــاڵیم کــەرێکی دێــز بــوو
چــاپۆك و وریــا گــەلێ بــەهێز بــوو
هەربەناو کەربوو رەوت و رەفتار خـۆش
عـەقڵی زیـاتر بـوو لـە بـەعزێ بێهـۆش
چونکە ئەو کەرە چوســت و چـالاك بـوو
دێزێکـی پەسـەند دەس و چـاو پـاك بـوو
خزمــەتم ئــەکرد بــە رۆژو بــە شــەو
نەمئــەدا بــە ســەد ئێســتری خۆشــڕەو
عەجەب شێری بـوو بـۆ رێگـەو سـەفەر
لە دەشت کـەژدا چوســت و هەڵمەتبـەر



کــــاتێکم زانـــــی خەبــــەریان هێنــــا
قاچــی کــەرە دێــز لــە بنــا شــکا
کـە دیـم کـەرە دێـز شـل و شـێواو بـوو
ســـەبرم لێـــبڕا چـــاوم لـــێلاو بـــوو
هاتــە گوفتــار لــە رووی قــارو قــین
ئەمــە چ کەســە لــە رووی ســەرزەمین
کـێ وا جەسـوورە سـاحێب زۆرو سـام
قاچی ئەم کەرەی جیا کـرد لـە ئەندام؟
شــەرتە هــەقی خـۆم، بـۆ خـۆم بسـێنم
ریشەکێشــی کــەم جــەرگی دەربێــنم



زانـــی غـــەزەبناك دڵـــم بەجۆشـــە
بـــۆ قەساســـی ئـــەو دڵ بـــە خرۆشـــە
بـــە رەســـمو تـــەعزیم هاتـــە پێشـــەوە
وتـــەی شـــیرین مـــەعنا کێشـــەوە
وتـــی غـــەم مـــەخۆ مەکێشـــە ئـــازار
هـــەقم بســـێنی رەحـــیمو غـــەفار
ئـــەم ئیشـــە ئیشـــی (............)
ئیشـی شـێخ رەشید کـە خزمـی خۆتـە



وەرنـــە کەســـی تـــر چ حـــەدی هەیـــە
تـــەجاوز بکـــا بـــەم دەرەجەیـــە
منـــیش ئومێـــدو رجـــام وەهایـــە
بـــۆ قەساســـی مـــن مەســـڵەحەت بوایـــە
وتم کـــەرە دێـــز قســـەت مەقبولـــە
قەناعـــەت ئەکـــەم لـــە لام مەعقولـــە
ئەمن خۆش ئـەبم (سـاڵح) خـۆش نابـێ[1]
بـــەم مەســـڵەحەتە قـــەت رازی نابـــێ
گەرچـــی خزمیشـــن عـــەفویان ناکـــا
خـــوێنی کـــەرە دێـــز تـــاقیق گـــوم ناکـــا



ســـاحێب تفـــەنگو دەمانچـــەو تـــیرە
ژێـــرەوژوور ئـــەکا خـــاکی (فـــەقیرە)
مـــەعلوم دیـــارە لـــە لام رۆشـــنە

---

[1] ساڵح شێخ ساڵح کارژاوییە کە هاوڕێی خۆشەویستی مەزلوم‌و شەریکی بووە لە کەسابەتدا.

خـوێنی کـەرە دێـز دەبــێ بـە فیتنــە
هاتـــەوە گوفتـــار بـــە دادو ئامـــان
وتـی (سـەید ئەحمـەد) دەسـم بـە دامـان
مـن قاچـم شـکاو حـاڵم بــێ فــەڕە
مـەڵێن کـەرە دێـز هـەر مایـەی شـەڕە

☆ ☆ ☆

لـــە حقـــوقی مـــن گـــەردن ئـــازابن
مـەحفوز لـە فیتنـەو بـەڵای خـودا بـن
تـۆش ئەگـەر مـەردی مـەردی بنوێنـە
(ســـاڵح) رازیکـــە دڵـــی مەشـــکێنە
ئـەمن بـە قسـەی ئـەو کـەری فـەقیر
چوومە لای (ساڵح) بـە فیکـرو تـەدبیر
وتم براکـــەم بـــە (نەصـــی) خەبـــەر
هەرکەس ئیسلام بـێ بـەڵای دێتـە سـەر

☆ ☆ ☆

ئێســـتاش کـــەرە دێـــز قاچـــی شـــکاوە
ئەڵبـــەت خوداوەنـــد ئەوەنـــدەی داوە
هەرچـەند قـاتیلی (شـێخ رەشـید) بـووە
ئـەمری خودایـە ئـەو سـەبەب بـووە
ئـەبێ سـابیر بـین، قەناعـەت بکـەین
کـاری خودایـە کـەس عـاجز نەکـەین
وتـــی: چـــی بڵـــێم قســـەم نـــەماوە
پـــەتی (تـــەمورم) یـــەکجار بـــڕاوە

☆ ☆ ☆

ئــــەهلی (فـــەقیره) ســــیغارو کیبـــار
ئــەمکردن بــە پەنــد واتـــەی رۆژگـــار
لــە حقــوقی خــۆم ســەرفی نــەزەر بــێ
گــەردن ئــازابن گــەر هــەزار کــەر بــێ
کەره دێــز چــونکه لــەفزی شــیرین بــوو
لــە بــۆ دوژمنــان مایــەی خۆشــبین بــوو
☆ ☆ ☆
کــــەره دێـــزم رۆ، کـــەره دێـــزم رۆ
مـــوتیعی فـــەرمان هـــیچ نەڕێـــژم رۆ
کاســـبی فـــەقیر هـــیچ نـــەزانم رۆ
ســـابیرو شـــکور بـــێ کـــاو دانم رۆ
ئـــازاو گورجوگـــۆڵ رێـــی کـــاروانم رۆ
شـــێری مەیـــدانی گشـــت کـــەرانم رۆ
☆ ☆ ☆
هـــەتا تــۆ مــابووی هــیچ بــاکم نــەبوو
غـــەمو غائیلـــەی خـــۆراکم نـــەبوو
کــەره دێــزم بــوو، بــۆ (ئــەخزی معــاش)
هەر کەره دێــز بــوو بــۆ کــاروانو ئــاش
ئێســـــتا تــــۆ رۆییـــت باڵـــت شـــکانم
ســـەرو ژێـــرت کـــرد بـــاری ژیـــانم
دوعایـــە ئەکـــــەم رەببـــی گیرابـــێ
ســـەبەبکارەکەت غـــەرقی بـــەڵا بـــێ

# من کە ئەزەل

مـن کـە ئـەزەل مشـتی خـاکم، چـوومە سـلکی ئینسـانەوە
مــن کــە ئینســانم حەقیقــەت، چـیمە بەسـەر حەیوانــەوە
دڵی بەدخوو ئەوا شێت بوو لـە دەس چەرخی زەمـان ئـەمڕۆ
کـە مـام رێـوی‌و چـەقەڵ چـوونە لانـەی شـێری ژیانـەوە
بـۆ لــە داخـا مـن نـەمرم، بۆچـی دڵـم لـەتلـەت نـەبێ
چــۆن مریشــك‌و کونەپــەپوو چــوونە ریــزی ئینســانەوە
وا لــە داخـا رۆحــم رۆیـی، بۆچـی نیگاهێکـت نـەکرد
کەســوکارت هــەموو مــردن خــۆ بــە خــاکی ئێرانــەوە
بۆچــی جارێــك تــۆ ناپرســی لــە ئـەحواڵی فـەقیرانت
هــەموو تووشـی وەرهــەم هـاتن چـوونە کـونجی زیندانـەوە
بۆچی فەلەك بۆتە خەرەك کە وا دۆخی غـەم هـەر بـا ئـەدا
تـــانوپۆی دڵـــی زارم کەوتۆتـــە نێـــو مەیدانـــەوە
لەگـەڵ ئـەغیاری بـەد سـیفەت دەخیلـە مەکـە لوتفـێ
کـە گـوڵزارو بـاغی ئەمـەل ئـەوەی بـە دەس نەزانـەوە
مەحسوبی تـۆ لـە هەرلایە ئەگـەر مابێ وەکـو (مـەزڵوم)
پەرێشــانن هــەموو ئـەمڕۆ بــە دەس جــەوری زەمانــەوە

# سەرگوزەشتەی مەزڵوم

سەرگوزەشتەی خۆم نووسی لە دەفتەر
ئیدارەو خوێندن تەواو سەربەسەر
شەش ساڵ بوو عومرم چوومە مەدرەسە
لە بۆ تەعلیمی عیلمو هەندەسە
هەتا دوو سێ ساڵ سەعیم کرد بە گیان
ئەوسایە مادەم چووە گوڵستان
وەقتێ کە عەقڵم تەواو هاتە دوو
بۆ خوێندەواری ئاگرم تێچوو
لە بۆ تەعلیمی عیلمو شەریعەت
چوومە سلەیمانی پڕ سزاو مەینەت
چەندە مامەوە بێ ماڵو بێحاڵ
بێ ئێوە ناخۆش رامبوارد بە سواڵ
جومعە دەعوەتم نانە رەقی کۆن
یا ماشێنی روون بە بێ تامو رۆن
من جەژنم ئەکرد بە شۆربای شیناو
ئەمکردە بەرم یەك کەوای دڕاو
لەگەڵ ئەم حاڵە بێ فلسو موفلیس
چواردە ساڵە بووم گەییمە تەسریف
چونکە لوتفی حەق یاوەرم نەبوو
بە تەرەقی خۆم باوەڕم نەبوو
وەسوەسەی دنیا بوو بە هامڕازم
بوو بە رەفیقی ئاواتەخوازم
مائیل بووم بە دڵ بە دنیاداری
کەمێ هەوەسو هەوای دڵداری
موبتەلابوونی (مەزڵوم) ئەپرسی
هەزارو سێسەد هەم چلی نووسی

# خەوم دی[1]

ئەمشـــەو لـــە خـــەوما مـــودیرێکم دی
ســـاحێب ئیـــدارەو ســـوڵتەو تەجـــەللی
مـــودیر وەزیفـــەی خـــۆی تـــەواو ئـــەکرد
ئیشـــی میللـــەتی بـــە سەرچـــاو ئـــەکرد
ئـــەیکرد تەماشـــای ئیشـــی ئیســـتیهلاك
فـــەرمانی ئـــەدا سەربەســـتو بێبـــاك
رۆژێ دای لەزەنگ فەراشی بـانگ کـرد
هاتـــە ژوورەوە تەمـــەننای بـــۆ کـــرد
وتـــی ئـــەم غـــەوغاو هەرایـــە چـــییە
ئـــەم خەڵقـــە زۆرە ئیشـــی بـــە چـــییە؟
وتـــی: ئـــەهالین هـــەموویان هـــاتوون
بـــۆ وەرگرتنـــی شـــەکر پەیـــدا بـــوون
کوێخاکـــەی دوێنـــێ رۆنەکـــەی هێنـــا
هـــاتووە بـــۆ شـــەکر ئێســـتا وا لێـــرا
فـــەرمووی، پێـــی بڵـــێ بێتـــە ژوورەوە
حورمـــەتی بگـــرە هـــەر لـــە دوورەوە
ســـۆئالی لێکـــرد لـــە رووی موحیبـــەت
حـــاڵو ئـــەحواڵو ئیـــدارەو ســـیحەت
وتـــی: لـــە ســـایەی لـــوتفی تـــۆ چـــاکین
فەقـــەت بـــێ شـــەکر، گـــەلێ هـــیلاکین

[1] کزەڵ بۆ ئەم هۆنراوەیە لە پەراوێزدا نووسیویەتی:
هەرچیت کە بینی بە راست یا بە خـەو
گشت لارو پەرچە ئێستایش وەکو نەو

شـەکری ئـەداتێ سـەری چـوار کیلـۆ
ئـەڵێی فـلان کـەس: ئەمیشـە بـۆ تـۆ
ئەگـــەر ئیشـــەکە ئـــاوا نەبوایـــە
بـە مـەرامی خـۆی شـەکرم ئەدایـە
فـــەراش دووبـــارە ئەچـــێتەوە ژوور
دیســـان تەمـــەنا ئـــەکات لـــە حـــزوور
ئـەڵێی فـلان شـێخ قوربـان هـاتووە
دوو ربـە نـۆکی بـۆ تـۆ نـاردووە
دێتـــە ژوورەوە ئەوەســـتێ ســـاتێ
سـەری سـێ کیلـۆ شـەکری ئـەداتێ
کەســـێ کاغـــەزی دۆســـتێکی بێنـــێ
سـەری دوو کیلـۆ شـەکر ئەسـێنێ
ئـــەمێنێ ئـــەهلی فـــەقیرو هـــەژار
مســـکێنو زەلیـــل، ژنـــی هـــەتیوبار
مـــودیر عاقڵـــە کـــە ئـــەیان بینـــێ
بـە جێگـای ئومێـد کەسـیان نابینـێ
ئـــەڵێ میعـــادی شـــەکر نـــەماوە
بـە بیتاقەیـە هـەمووی نووسـراوە
ئیـتر بـە هـیچ کـەس شـەکر نـادرێ
بـــڕۆن بـــەیانی شـــەکر ئـــەدرێ
وەقتـــێ ســـبەینێ فـــەقیرو هـــەژار
ئەچـنەوە سـەری بـە چـارو ناچـار
مـــودیر بیتاقـــە لای خـــۆی دائـــەنێ
یەکـە بـە یەکـە ئیسـمیان ئـەخوێنێ
بە هەشت سەرخێزان بە سەد موشـەقەت

کیلۆیــە شــەکر ئــەدا بــە رەحمــەت
ئەگــەر فــەقیرێ شــەکوای خــۆی بکــا
لێــی عــاجز ئــەبێ هــەم ریســوای ئــەکا
ئــەڵێ هــەی وەحشــی بــۆ عــەقڵت وایــە
بۆچــی کارگــەی شــەکرم لــە لایــە
حکومــەت چــی داوە هــەر ئــەوە ئــەدەم
مەعلوم حەقی کەس بە هیچ کــەس نــادەم
کەســێ گــوێی لێبــێ ئــەڵێ عادلــە
ســاحیب ویجدانــە خــەیلێ عاقڵــە
یــاخوا قــانونو ئیــدارەی وەهــا
خــوا نەیــدا بــە کــەس نــەبێ موبتــەلا
کە ئەم حاڵــەم دی مــەعلوم بــوو لــە لام
بێدار بووم لە خــەو بــە گــورجی هەســتام
وەقتــێ ئــەڕوانم مــاڵی خۆمانــە
لــە کــوێ مــودیرەو، کامــە دیوانــە

# بۆ (شێخ سەلام)ی شاعیر

ئـەرێ هـەی دڵـەی غـەمباری حـەزین
تــەیری نــامراد ئــاوارەو غـــەمگین
راپـــەڕە بـــڕۆ بـــۆ لای دۆســـتانم
دۆســـتی قـــەدیمم ئـــارامی گیـــانم
رێگـــا بگـــرە بـــەر بـــڕۆ تـــۆ بـــە تـــاو
تـــۆ رووبکـــەرە قەڵاکـــەی بـــاراو



ئـــازا کوڕانـــە ســـەرکەوە بـــە گیـــان
ســـەرەوژێر بـــڕۆ بـــەرەو لای (چـــنگیان)
لـــەوێ مەوەســـتە بگـــرە ملـــەو رێ
رێگـــا ئەتباتـــە مەرکـــەزی نـــۆدێ
بزانـــە نـــۆدێ جێگـــای پیرانـــە
مەرکـــەزی نـــەوەی شـــێری یەزدانـــە



بکـــە زیـــارەتی مـــەردانی ئـــەوێ
ئوتـــومبێلی پێـــت بخـــەرەوە رێ
بەســـەر (هـــەرمنا) بـــڕۆ بـــە حـــزوور
هـــەتا ئەگەیتـــە ئـــاوی گوکـــە ســـوور
لەسەر ئەو چـەمە هـەر مـەگرە لەنگـەر
هـەتا لـە هـەوراز راسـت ئەچـیتە سـەر



دڵــــە بزانـــە ئـــەو قـــەزا جوانـــە
جێگـــای شـــەرەف‌و کـــانی ویژدانـــە
جێـــی ئاسایشـــی ســـوڵتەی دەوڵـەتـــە
مایـــەی فـــەرەح‌و ژینـــی میللەتـــە
رووکـــەرە تـــەموین دڵـــەی پـــڕ هونـــەر
لـــە بـــۆ دیـــدەنی دۆســـت‌و بـــرادەر
ئەگـــەر ئەتـــەوێ تـــۆ بـــێ رووســـوور
(ســـەلام) بناســـە لـەگـــەڵ چـوویتە ژوور
چـــۆن موعتەبـــەری هـــەموو دیوانـــە
بـــێ ئوســـوڵ نـــەبی ســـەلام بزانـــە
عـــەرزی ئیخلاســـم تەقـــدیم کـــە دەردەم
ئـــەمجا دەســـخەرە ناودەســـی ئەدهـــەم
وەکیلـــی منبـــە ئـــەی دڵـــەی (مـــەزڵوم)
عـــەرزی ئیخلاســـم تەواوکـــە مـــەعلوم

حوزەیرانی ١٩٤٣

# بەرزنجە

بەرزنجەیـــە مەرکـــەزی ئـــەولیاو قـــوتبی زەمـــان
بەرزنجەیـــە مەســـکەنی ئەســـفیاو مـــەردی جیهـــان
جێیـــەکی پـــڕ عـــیلمو ولاتێکـــی پـــڕ لـــە حـــیلم
مـــەکانێکی موقـــەدەس، بـــۆ ئـــەورادو زکـــری ســـوبحان
خـــاکی نـــەزەر کـــردەی تەهایـــە بـــە حەقیقـــەت
نابـــێ مـــەدحی ئـــەو خاکـــە تـــەواو، نـــاکرێ بـــەیان
ئاب‌و هەوای وەك بەهەشتە، ئابـاری عـەینی کەوسـەر
جێگای سیدق‌و سەداقەت، جگە لـە ئینس لـە جـان
جـانم فیـدای سـروەت بـێ، ئـەی خـاکی پـڕ هونـەر
ئـەی ئیحیاکـەری نـەباتات‌و جـەمیعی گیـاو گـوڵان
لەوساوە کە (شێخەین) دەرچوون لـە دنیـا بـە وەفـات
ســـوتاوە بـــاغی ئەمـــەل تووشـــنەیە دڵ پەرێشـــان
هیممەت بکە ئەی منـەوەر بـە نـوورت جوملـە ولات
خەلاسـی بـێ بـەڵکو، دڵـی خەسـتەم لـە هیجـران
دڵی (مەزڵوم) لە کەیفی بەخششـی تـۆ وەك مـەجنون
دەتکێ لە هەوری چـاوم، ئەشـکم بـە میسـلی بـاران

# قەڵای سروچك

ڕۆژێ بـۆ سـەیران بـە کـەیفو سـروود
چـوومە لای قـەڵای سروچـك مەشـهوور
وەقتـــێ ئـــەبینم قـــەڵای بێشـــومار
گشـــت خـــراپ بـــووە لەســـەرتابەخوار
تـــەواو ڕووخـــاوە دیـــوانو ســـەرا
شـــەقی بـــردووە وەك تـــاقی کیســـرا
پرســـیم ئـــەی قـــەڵا کـــۆنی وێرانـــە
کـێ تـۆی کـرد بینـا لـە ڕووی زەمانـە

☆ ☆ ☆

کـام حـاکم، نەخشـەی تـۆی دارِشـتووە
چ پاڵـــــەوانێ تـــــۆی وا کـــــردووە
وتـــی: لـــە عەســـری قـــەدیمی زەمـــان
(ســـەلیم شـــا) بـــووە، فارســـی زمـــان
منـــی بینـــا کـــرد بـــۆ ژیـــانی خـــۆی
سەنگەربووم بۆ خۆی، ڕوونـاك بـۆ ئاسـۆی
خـۆی حـوکمی ئـەکرد بێبـاك لـە دونیـا
بەیـــداخی حـــوڕی لـــە بـــۆ هـــەڵکرا
گـەلێك زۆردار بـوو، سـاحێب پەهلـەوان
ســـیلاحی جـــەنگی شمشـــێرو قـــەڵخان

☆ ☆ ☆

ڕۆژێ (ســـەلیم شـــا) پرســـی لـــە ژنـــی

لــە مــن چــاپوکتــر تــۆ کــەس ئــەبینی
چــالاکتــر لــە تــۆم بــە چــاو نــەدیوە
نــاوی کەســێکم بـــەڵام بیســـتووە
گـــەلێ شـــەجیعە ســـاحێب جەمالـــە
خـــەیلێ خرۆمەنـــد زۆر بـــە کەمالـــە
نـــاوی مەشـــهوورە: ســـەید قەڵەنـــدەر
جێگـــای بەرزنجـــە، لـــە نەســـلی حەیـــدەر



بـەم قسـە خـەیلێ (سـەلیم) بـوو غـەمبار
جـــوابی ژنـــی دا لێـــی هاتـــە گوفتـــار
وتـــی: ســـبەینێ بـــە مـــەودای خەنجـــەر
ئـــەبڕم لـــە بنـــا ســـەری قەڵەنـــدەر
کــە هێنــام ســەری قەڵەنــدەر بــۆ لات
جەســـارەتی مـــن مـــەعلوومی ئـــەدات
ئـــەمری کـــرد ســـوپا تـــەواو خرۆشـــا
ئەســـابی جـــەنگی بـــە قۆشـــەن پۆشـــا



وەقتـــێ قەڵەنـــدەر خەبـــەری زانـــی
ســـەلیم چـــەند ســـوپاو لەشـــکری هـــانی
پۆشـــای بـــە بـــاڵا هـــەر وەکـــو حەیـــدەر
شمشـــێرو قـــەڵغان، پێکـــان و پێکـــەر
رووی کـــردە ســـوپاو لەشـــکری عـــەزیم
تــا لــە (سـڵاوگە) گەیشـت بـە سـەلیم
دەســـتی دا شمشـــێر ســـەید قەڵەنـــدەر
بـە قەسـدی کوشـتن کەوتـە نـاو لەشـکر

سـەلیم پەهلـەوان دەسـتی دا کـەمان
لـە بـۆ قەلەنـدەر خـۆی کێشـا مەیـدان

☆ ☆ ☆

چـەند زەربـەی سـەختی دا لـە قەلەنـدەر
بـە زەڕبـەی سـەلیم نـەیهێنا زەرەر
دەسـتی دا خەنجـەر قەلەنـدەر بـە قـار
هـەر وەکـو عـەلی حەیـدەری کـەرار
بـە شـیپی خەنجـەر کـە هەڵمـەتی بـرد
سـەری سـەلیم شـای لـە تـەن جیاکرد
لەشـکری سـەلیم رووی کـردە فـیرار
بـەعزێ بـۆ زەڵـێ قسـمێ بـۆ کۆسـار[1]
قـەڵای سروچـك بـە زەربـەی هونـەر
گـیرا بـە زۆریـی بـازووی قەلەنـدەر

☆ ☆ ☆

تـەواو لەشـکرو سـوپای سـەلیم شـا
هـەموو تەسـلیم بـوون، سەراسـەر گـیرا
سـەری سـەلیم شـا، قەلەنـدەر دەردەم
لـە بـۆ تەماشـا نـاردی بـۆ حـەرەم
حـەرەمی سـەری سـەلیم شـای بینـی
گـاه گـاه ئـەگریا، گـاه پێئەکـەنی
ئـەم وەسـفەی عەجـەب هاتـە بـەر نـەزەر
ماجـەرای پرسـی سـەید قەلەنـدەر
وتـی سـەلیم شـا لـە رووی حەرەمـدا

---

[1] زەڵێ: ناو دەشتاییەکە لە بەردەم بەرزەنجەدا.

دویَ فـــەخری ئـــەکرد لافـــی لیئـــەدا

☆ ☆ ☆

ئـــەیووت بـــە زۆری بـــازووی پـــڕ هونـــەر
ئـــــەبرم ســــــەری ســــــەید قەلەنـــــدەر
فـــەخری کـــرد بۆیـــە وا کەســـری هـــانی
لافـــی عـــەکس بـــوو، ئەیـــدا زوبـــانی
لـــە پـــاش نـــەمانی حـــوکمی ســـەلیم شـــا
ســـــەراو ئـــــەیوانم سەراســـــەر رووخـــــا
ئەمـــــە چـــــەند قەرنــــە ئــــەمن ویرانـــــەم
ســـــەرکزو شـــــێواو، دەســـــتی زەمانـــــەم
حـــاڵم ئەمەیـــە بـــۆت ئەکـــەم بـــەیان
نەشـــریکە (مـــەزڵوم) بیکـــە بـــە ئـــیعلان

# نەورۆز[1]

بیستوومە کورد، جەژنی بوو سالان
لە حەمدی خواوە ئەمساڵ بوو بە دووان
لە نەورۆزدا بوو دەوڵەت بۆ کوردستان
فریای هەژار کەوت، وەك مەردی مەیدان
بوونە سەبەبی ژینی هەژاران
ئەی زاتی گەورەی ئەم حکومەتە
دوعا گۆییتان بۆمان فرسەتە
چونکە کۆششتان ژینی میللەتە
هەوڵو تەقەلای حوبو حورمەتە
دائیم دوعا گۆم بە دڵو بە گیان
بەراتی فەرموو دەوڵەت بە هەژار
بۆ گەدای لادێو هەژارانی شار
گەنمو جۆی زۆر دا بە فەردەو بە بار
جەژنانەی جەژنی نەورۆزی بەهار
بژی حکومەت، بمێنێ بۆمان
هیممەتی تۆیە زۆر بە ئاسانی
هەژاری دەرکرد لە چنگ گرانی
ویستی کە میللەت خۆشی ژیانی
بۆیە گەنمو جۆی زۆری بۆ هانی
پایە بلند بێ تا ئاخر زەمان

[1] ئەم پارچە هەڵبەستە لە سالانی ١٩٤٢ – ١٩٤٣دا وتراوە کە لە کاتی جەنگی جیهانی دووهەمدا گرانییەکی گەورە بووە، لەو کاتەدا حکومەتی عێراق گەنمی بەسەر دانیشتوانی ئەو ناوچەیەدا دابەشکردووە بە سەرپەرشتی مامۆستا (زێوەر)، ئەم کارە بووە بە هەوێنی ئەم هەڵبەستە.

# ئامری موشفق

ئـــامری موشـــفق گـــەورەی میهرەبـــان
پاشـــازای مەشـــهوور، ئـــەمیری کـــوردان
گەر مەدحـــەت بکـــەم ئیســـمی کـــەریمت
پشـــــتی ســـــەخایی حاتـــــەمت شـــــکان
ئیـــــدارەو عـــــەدلت بۆتـــــە نموونـــــە
لـــــە رووی دنیـــــادا وەك نەوشـــــیرەوان
میللـــــەت پـــــەروەریت زۆر بێشـــــومارە
چـــاوی ئیحســـانت ئـــەبینن هـــەمووان
یـــەزدان داویـــەتی بـــە مـــن فەرزەنـــدێ
عومری گەییوە بـە سـێو چـوار مانگـان
بـــەختی بـــێ رزقـــە، ئیقبـــالی شـــوومە
دایکـــی بـــێ شـــێرە، تیفلـــی بەســـەزمان
بـــە چـــەند مەینـــەتو بـــە کـــوێرەوەری
پەروەردەی ئەکەین بـە شـەکرو رازیـان
ئەمـــە چـــەند رۆژە شـــەکری نـــەماوە
گریـــــەو فوغـــــانی ئەگاتـــــە ئاســـــمان
جـــا بـــۆ ئیـــدارەی ئـــەم بێگوناهـــە
ئیلتیجـــا ئەکـــەم لـــە عەدالـــەتتان
ئـــەمر بفـــەرموون شـــەکری بـــدرێتێ
تـــاکو بێچـــارە ئـــەمرێ لـــە برســـان

# ئیقتیساد

حکایـــــەتێکی کـــــورت‌و موختەســــەر
بۆتـــــان بەیانکـــــەم بیخەنـــــە دەفتـــــەر
وەکـــو شـــانامە هـــەر شـــەو لـــە لایـــە
بیخوێننـــــــەوە لـــــــە لای مەلایـــــــە
باســـــی ئیقتیســـــاد ئەکـــــەم بـــــرادەر
گرتنـــــــی نەفســـــــە نـــــــەوەکو زەرەر
داهـــــاتی خۆمـــــان بـــــا بخـــــۆین چـــــاکە
ســـــنعاتی وەتـــــەن دروســـــت‌و پاکـــــە
کلاشـــــی خۆمـــــان ســـــەراپا پـــــەڕۆ
بیکـــــەرە پێـــــت‌و خێـــــرا پێـــــی بـــــڕۆ
کەوشـــــی یەمـــــەنی بـــــۆ پیـــــاو موناســـــیب
جـاش کەوشـێ بکـڕە بـۆ پیـاوی کاسـب
لـــە خـــوری‌و مـــەرەز، پۆشـــاك‌و بـــەرگت
بـــازاڕت گـــەرم بـــا دووربـــێ مـــەرگت
دۆشـــاوی باســـوق ئـــەنواعی حـــەڵوا
خۆشـــاوی شـــەربەت مـــەدە بـــە خورمـــا
شـــەرابمان دۆشـــاو، (مێـــوژە خـــۆڵاوە)
فرێیـــــدە چـــــایی‌و ئەســـــابی قـــــاوە
ئیقتیســـــاد بکـــــە هـــــەر بخـــــۆ ســـــەبیل
جگـــەرەت نـــەوێ گـــوێ مـــەدە بـــە فیـــل
مـــەکرە شـــقارتە بـــە پـــارەو قـــرووش
ئەســـتێ هـــەڵگرە تـــاوێکی بـــۆن خـــۆش
کـــە پنـــەکم خـــوری هـــی مـــەڕی ناوجـــار
نامـــەوێ پـــاڵتۆی بـــیلادی‌و بولغـــار
باســـــی ئیقتیســـــاد گـــــەر بکـــــەم بـــــەیان
قەڵـــــەمی (مـــــەزلوم) بـــــۆم نایەتـــــە ژوان

# بەرزنجە

خاکــــە پاکەکـــەی بەرزنجـــەی دڵگـــیر
بێشـــەی شـــێرانە جێـــی ئـــەولیاو پـــیر
چـــاوگەی ســـازگاری داوێنـــی چـــیا
دەرمـــــانی دەردی نەخۆشـــــی ئـــــەدا
ســـــروەی نەســـــیمی بـــــەیانیانی زوو
بـــە شـــنەو خەنـــدەو شـــادی دێتـــە روو
ئـــاوی ســـازگاری چـــەشمەی خـــاوەن فـــەڕ
شـــیفای دەردانـــە لـــە لوقمـــان چـــاکتر
چ چـــاو ئەنـــدازە وەلیکـــەی نـــازدار
بـــە دێمـــن بوونـــە مێـــرگو مێرغـــوزار
عـــــەماری نـــــۆكو زەڕاتو جۆیـــــە
چ خـــۆش نیشـــتمان بـــۆ مـــنو تۆیـــە
دەنـــگو چـــریکەی کـــەوێ کوێســـتانان
ئـــەخوێنێ وەســـفی خۆشـــی نیشـــتمان
وەختـــێ شـــوعلەی رۆژ ئەیـــدا لـــە شـــاخان
پرشـــە پرشـــی دوور ئـــەدا لـــە کـــەیوان
وەکـــو ئاوێنـــەی جـــامی جـــەم وایـــە
هـــەردەم وێنەیـــەك لـــە نـــاوی دایـــە
بـــە رەزا لەگـــەڵ خونچـــەی گوڵانـــدا
بـــە یـــەکتر شـــادن لەســـەر ملانـــدا
تێـــك ئـــاڵۆزاون گوڵاڵـــەو چـــنوور
ئەم بە کەوای سـەوز ئـەو بـە رەنگی سـوور
نەخشـــاوی ئـــەمری زاتـــی کردگـــار
وەســـفی خۆشیشـــی دوورە لـــە گوفتـــار

# هەر بمێنی

هـــەر بمێنـــێ چـــاکە نـــەمرێ، کۆنـــەحیزو باجییـــە
چـــونکە ماتـــە بـــۆ حـــاڵی خـــۆی، باعیســـی ئازادییـــە
شـــێتو شـــەیداو هیلاکـــی تـــۆزی ئـــاوی شـــەهوەتە
حـــاڵو شـــەرمی کوانـــێ، دینـــی، تـــاڵیبی گەوادییـــە
ســـەری زلو سمتـــی پـــانو چـــاوی شـــۆڕی دیـــارە
کۆنـــەحیزی چـــۆڵو دەشـــتو پـــاڵ کـــەژو نـــاو ئاواییـــە
تـــا بمێنـــێ ســـەیرو ســـەفای نـــەرمو شـــلی ســـەر سمتەکـــەی
هەر لـە کەیفو شەوقو شادی هەر لـە عیشـوەو شـادییە
بەرقـەرار بـێ، دەبـێ چـاکە بـەر قـەراربێ، بەرقـەرار
نەرمو شل ناو دۆڵی سمتـی، گەرمـە کـوورەی حەدادییـە
تـــۆ لـەگـــەڵ حیـــزو قەحبـــەو زۆڵو حـــەرامزادەی
چـیتە کـارت کاکـە (مـەزڵوم) باعیسـی بـێ چـاوییە

# من و بەگ

مــن ئــەزەل نیمــە خــوڵقی بــێ حــەیایی‌و بــێ شــەرم
بــەگ جــەنابی دوو بــەیانی سمتــی وا کەوتــە بــەرم
بێ تەحەموول، بێ قــەرار بــوو دەســتی نایــە دەستم وتــی
مــن لــە بــۆ شــێخ‌و مــەلا بەندەیــەکی بــێ ســەرم
وتم ئەی بەگ بێ موشــەقەت پــێم نیشــاندە رێــی حــەرەم
وتــی مــاڵ‌و گشــت حــەرەم پێشکەشــت بــێ ســەرووەرم!
وتم لوتفــت بــا زیــاد بــێ، کــامی لــووس‌و بــێ مــووە
وتــی یــا شــێخ خــۆت ئــەزانی لــەم حســابە بــێ بــەرم
عــەرزی مــیرم کــرد کــە سمتــی رەعنــا خانــت نازکــە
وتــــی ســــاحێب ئیختیــــاری نازەنینــــە هــــەم نــــەرم
وتم ئــەی بــەگ پــێم نیشــاندە تــۆ مــەکانی خــەڵوەتم
وتــــی بەنــــدە خــــادمێکی بــــێ نــــەواو بــــێ فــــەڕم
فەردی (مەزڵوم) فەردی رەعنا شیعری فــەردی کوردییــە
پــڕ لــە لــەغزو پــڕ موعــەمما مــن شــایەتی نــاو دەفتــەرم



کــــە دنیــــای بــــە گــــای بــــێ گــــاوان زانــــی
تێکــــــــی بشــــــــکێنێ‌و بیکــــــــا تــــــــاڵانی
لــــە بــــۆ ریــــش هــــات‌و هیتلــــەر نــــەیزانی
کــــــە سمێڵیشــــــی دەنێتــــــە بــــــانی

# بسم اللّٰە

ئەی قەڵــەم تــۆ بــۆم بنووســە بــە جــارێ نــاوی بســـم اللە
ئــەی زوبــان تــۆ بــۆم بەیانکــە بــە دائــیم نــاوی بســـم اللە
لـە ئیجرای نوێژو دینــە، بــۆ حیفـزی دیــن هــەر پەرژینــە
دەم بــە دەم تەرکــە زوبانــت دەخیلــە تــۆ بــە بســـم اللە
چ کارێ موشــکیل گوشــایە، دەلیلــی چــۆڵو ســەحرایە
رەفیقـی کــاری تەنهایــە لێــت مــەعلوم بــێ بســـم اللە یــە
چـــرای شـــەوی تاریکـــە، دەلیلـــی پـــردی باریکـــە
رەفیقانـــت تـــۆ حاڵیکـــە یەکســـەر بڵـــێن یـــا بســـم اللە
کــاری گــران ســەهل ئــەکا، دڵــی وێــران تــەعمیر ئــەکا
هەزاران شــەیتان زنجیر ئــەکا، تــۆ هــەر بخوێنــە بســم اللە
لـــە ئـــەجزای نوێــژو دینــە، لـــە ئەســـبابی خـــوا ناســـینە
بــۆ ئــایینیش ئــەو پەرژینــە، هــەموو شــادبین بــە بســم اللە
باعیسی ئــاوی کەوســەرە، سەربەســتی رۆژی مەحشــەرە
رۆژی جـــەزا موعتەبـــەرە، کاکـــە بڵـــێ تـــۆ بســـم اللە
لێت مەعلوم بێ ناوی خوایە، زیکری جوملــەی ئەنبیایــە
(ئەورادی) شا هەم گەدایە شــامو ســەحەر هــەر بســم اللە
دەخیلــت بم (مــەزڵوم) ئامــان تــۆ بزانــە بــە رۆحو جــان
فــەرت نییــە بــە تۆزقاڵــێ ئەگــەر نــەڵێیت تــۆ بســـم اللە

# شوکرانە بۆ خوا

حەمـدو سـەنای زۆر لـە بـۆ ئـەو خوایـە
مـەوجودە دائـیم لـە هـەموو لایـە
خـالّقی ئاسمـان، حـەوت بـە حـەواوە
بـە بـێ کۆڵەکـەو دیـوار وەسـتاوە
سـفرەی رەحمـەتی داخسـت لـە زەمـین
لـە بـۆ مەجوسـیو گـەبرو موسـلمین
لـە سـفرەی ئـەوە بـە عـەدلو کـەرەم
رۆژانـە ئـەخۆن عالـەم زۆرو کـەم
فـەرق ناکـا دۆسـتی لەگـەڵ دوژمنـدا
هەرکـەس بـە پێـی خـۆی رزقـی پـێ ئـەدا
موڵحیـد کفرکـاو رێـی عیسـیان بگـرێ
لـە رزقو دۆزی فلسـێ نـابڕێ
دۆستو دوژمنـی هـەر بـە یـەك دەسـتوور
رزقیـان ئـەداتێ، بـەڵام خـوارو ژوور
قسـمێ بـە رەنـجو هـەوڵو تەقـەلا
هەنـدێکیش ئەیـدات لـە لای (لابـەلا)
قسـمێ بـە زۆری قـۆڵو هـەوڵی شـان
قسـمێ تـر ئـەیخوا نـانی (ناوچـەوان)
بـە قسـمێ ئـەدا نگـینو ئیقبـال
ئـەبێ بـە (قـارون) بـە سـەروەتو مـاڵ
قسـمێ تـا نـانی رۆژێ ئەسـێنێ

ڕیخۆڵـــەو دڵـــی بـــە ڕەنـــج ئەپســـێنێ
تەقســـیمی ئـــەزەل چـــۆن بـــۆی دانـــاوە
هـــەر ئـــەوەی هەیـــە هـــەتاکو مـــاوە
بـــە بـــەعزێ ئـــەدات نـــانی موشـــەقەت
بەعزێ ئیستڕاحەت، ســەیرانو ســیحەت
(مـەزڵوم) پێـی نـاوێ خـۆت موبتەلاکـەی
بـــۆ دونیـــا خـــۆت تووشـــی بەڵاکـــەی

# مردن

مــــردن لـــــە داغـــــت دڵ پــــڕ بـــــرینم
شـــەوو رۆژ دائـــیم هـــەر لـــە گـــرینم
بــە شــەو خــەیاڵت کــە دێ بــە ســەرما
بڵێســـــەی ئـــاگر وا لـــــە جگـــــەرما
ئـــــەحواڵی قـــــەبر دێتـــــە بەرچـــــاوم
دەجۆشـــــێ دڵو جـــــەرگو هـــــەناوم
بڵێســـــەو گـــــرەو گریـــــەی دەروونم
قرچـــــەی دڵەکـــــەی زارو زەبـــــوونم
ئـــاگری عیســـیان لـــــە ســـــەرتابەخوار
دەتکــێ لــە ئــەعزام ســووتانی یــەکجار
نـــــەماوە ســـــەبرو تاقـــــەتو تـــــابم
غـــــەیری ئـــــازارو دەردو عـــــەزابم
بەو حاڵــە (مــەزڵوم) شــەو دەباتــە ســەر
بە سەد موشــەقەت جــەفاو دەردی ســەر

# پاڕانەوە لە خزمەت پێغەمبەر

یــا محەمــەد مــن زەلیلــی دەســتی شــەیتانم دەخیــل
شــەرمەزارو رووســیاهو غــەرقی عیســیانم دەخیــل
دڵــــڕەش و بێتاعـــەت و شــــەرمەندەیی قاپیەکــــەتم
بێکەســم، دەربــەدەرم، حــەبس و، زینــدانم دەخیــل
غــەیری لوتفــت مــن پــەناهو پشــتیوانم خــۆ نییــە
یەك نەزەرکــە، جاربــەجاریَ مــەردی مەیــدانم دەخیــل
مەزرەعەی تــەقواو تاعــەت، وشــك و بــیَ ئــاوە تــەواو
ئیلتیمــاس چــارە، ئــەی هــەوری رەحمــیَ دەخیــل
بیَ دەلیل و کوێری رێگەم، بــیَ قایــدو دەســت و عەســا
ســــەرکزو دڵ حـــەزینی رۆژی میـــزانم دەخیـــل
تــۆی (شــەفیعی مــوزنبین) و مــن زەلیلــی دەرگاکــەتم
بگــرە دەســتم موســتەحەقی قــەعری نــیرانم دەخیــل
رەحمی تۆیــە مــن ئومێــدم، ئــەی رەحمەتــەن لــلعالــەمین
منــی (مــەزڵوم) دڵ حــەزینم دەس بــە دامــانم دەخیــل

# پێغەمبەر

قەڵـــەم، قوربـــانی، نـــووکی خامـــەت بم
دیســـان بـــە فیـــدای ســـەتری نامـــەت بم
بنووســـە مـــەدحی شـــای خەیرولبەشـــەر
یـــەعنی محەمـــەد شـــەفیعی مەحشـــەر
بهێنـــە تـــەحریر ســـەڵات و ســـەلام
بـــۆ خـــۆی و ئـــەهل و ئەســـحابی کـــیرام
شـــەوو رۆژ دائـــیم ســـەڵات و ســـەلام
بنووســـە نـــەعتی شـــای خەیرولئـــەنام
لەبـــەر تـــۆ کـــردم (دنیـــاو مـــا فیهـــا)
بـــەرِو بـــەحرو ئـــاو، هـــەم بـــادو هـــەوا
تـــۆم کـــرد بـــە شـــافیع رۆژی قیامـــەت
شەفاعەت بکەیت خـۆش بـە لـە ئومـەت
بـۆ مـوعجیزەی ئـەو بـەردی بـێ گیـان:
هێنایـــە گوفتـــار هـــەر وەکـــو ئینســـان
ئـــەو مســـتەفایە دۆســـتی خوایـــە
لەبـــەر ئـــەو دنیـــاش هاتۆتـــە کایـــە
لـــە رۆژی حســـاب، ســـاحێب گوناهـــان
ئەکـــەیت شـــەفاعەت لـــە رۆژی دیـــوان
عاســـی و خـــەتابار لـــە ئوممـــەتی تـــۆ
ئەبەخشـــێ لەبـــەر خۆشەویســـتی تـــۆ
خـــودا بـــە جـــاهی شـــای بـــۆراق ســـوار
خۆشـــبە لـــە جـــەوری (مـــەزڵوم)ی هـــەژار

# تەکەبوورکردن

بیســـتوومە رۆژێ شـــەیتانی مـــەبغووز
کـردی تەماشـا لــە لـەو حلمـە حفـووز
دیتــی بــە خــەتی قــودرەت نووســراوە
بــە فرمــانی حــەق، ئــیعلان کــراوە
یــەك مەلائیکــەی مووقــەڕەبی خــوا
لــە ئــەمری ئـامر (بــێ ئــەمری ئـەکا)
شەیتان ئەمەی دی لـە لـەوح نووسـرابوو
بــە ئــەمری یــەزدان نەشــر کرابــوو
گەلێ مـەغروور بـوو تەکـەبووری کـرد
تـا تـەوقی لەعنــەت بەرگـەردنی کــرد
(مەزڵوم) ئەگەر تـۆ هۆشـت بـێ لەسـەر
قەت تـفو لـەعنـەت ناکـەی لـە بەشـەر

# شوکرانە بۆ خوا

حەمدو سەنای زۆر بۆ خودای بێپاك
لا شەریکە ئەو، فەردو تەنهاو تاك
خالّقی وەحشیو مەلو موورو مار
رازقی رزقی زیروّحو گیاندار
دروستکەرەکەی سەماو سەر زەمین
دۆزەخو ئەعراف، فیردەوسی بەرین
ئاگاهدار لە حاڵ، حاڵی بێ حالاّن
هەم بێداری شەو، ناڵەی زامداران
ئادەمو حەوات دروست کرد لە خاك
بە سوورەتی جوان بە ئەخلاقی پاك
بە لوتفو کەرەم بە رووی موحیبەت
ئەمرت پێکردن تا بچنە بەهەشت
فەرمووت لە گەندم مەخۆن وریابن
نزیکی مەبن لێی تەوەللابن
شەیتانی لەعین تەفرەتان نەدات
بە سیحرو جادوو ئیغفالتان نەکات
تەقدیری خۆت بوو شەیتانی بەدبەخت
خۆی کرد بە عابد چووە ناو بەهەشت
بە مەکرو حیلە ئیغفالی کردن
کە گەندمیان خوارد بێحاڵی کردن
چەندە مانەوە بە عسیانەوە
تۆبەیان ئەکرد ئەپاڕانەوە
بە لوتفو کەرەم تۆ عەفووت کردن

دیـــسان رەوانـــەی ســەر زەویـــت کـــردن
لـە نەسلی ئەوان چەند ســەد هــەزار کــەس
کـــردت بـــە نـــەبی، نامـــەت دانـــە دەس
بـــۆ ســەر تـەوائیف یـەك بـە یـەکت نـارد
بـــۆ تـــەبلیغی دیـــن حوکمـــت پێســـپارد
تـــۆ لێـــی خـــۆش ئـــەبی ئەیخەیتـــە جینـــان
ســـیرەتی بابـــە بـــۆ فرزەنـــد جێمـــان
بـــۆ خـــۆت فەرمووتـــە تۆبـــەم قبوڵـــە
تۆبـــەی حـــەقیقی لـــە لام مەقبولـــە
مـــن گـــەلێ عاســـیو خەجاڵـــەتبارم
روو زەردو مـــەحجووب هـــەم شـــەرمەزارم
ســـیوای زاتـــی تـــۆ هـــیچ کـــەس ناناســـم
راجعـــی خـــۆتم خـــراپ یـــان خاســـم
خودایـــە تۆبـــەم لات بـــێ قبـــوڵ
چـــونکە مـــوزنیبم (مـــەزڵوم)و مـــەلول

# نەخۆشی مردن

حـــەکیمی دەردان، حـــەکیمی دەردان!
شـیفا بەخشـی کـوول دەردی بـێ دەرمـان
لـــە وەقتـــی حالّـــەت (مـــەرەزی مـــەوتا)
بگـــە بـــە هانـــام کـــەریمی یـــەکتا
پـــەناهم بـــە تـــۆ پادشـــای مـــەنان
قـــەترەیێ رەحمـــەت دەریـــای بێپایـــان
بـەڵکو خـەلاس بـین لـە هـەموو دەردان
مـەحفوزمان بکـەی لـە سـەلبی ئیمـان
دیســـان لـــە دەســـتی شـــەیتانی لـــەعین
نـــەجاتم بـــدە پادشـــای مـــوعین
بـــەڵکو دەربچـــم لـــە دونیـــای فـــانی
بـــە ئیمانـــەوە بـــۆ جاویـــدانی
هـــەم بـــە ئاســـانی دەربچـــێ رۆحـــم
تۆبـــەبێ خـــوا تۆبـــەی نەســـوحم
قـــەومانو خۆیشـــان هەریـــەك لەلایـــە
شـــینو گـــرینو هـــەر واوەیلایـــە
منـیش هـیلاکم لـە تـاو دەردی خـۆم
لـە ئێشـی نـەزعو حـاڵی مـەرگی خـۆم
تکایـە عەشـرەت، بـۆ مـن قـەت مـەگری
هەرکەس بۆ حـاڵی مـەرگی خـۆی بگـری
هـەموو کـەس ئـەمرێ یـەقینو مـەعلوم
منـــیش بـــەرێوەم زەعیـــفو (مـــەزڵوم)

# کفن و دفن

پادشـــای غـــەفوور، پادشـــای غـــەفوور
رەحمـــانو رەحـــیم، پادشـــای غـــەفوور
هیـــوام بـــە تۆیـــە، حـــاکمی مەحشـــەر
قەڵـــەمی عـــەفووم بـــدەی لـــە دەفتـــەر
وەقتـــیَ کـــە مـــردم، گیـــانم لـــەدەس چـــوو
قـــەومو خوێشـــانم هـــەموو مـــەئیوس بـــوو
کفـــــن ئـــــەکڕن بەقـــــەدەر بـــــاڵام
بـــە دڵـــی حـــەزین بـــە جـــەرگی پـــڕ زام
مـــەلا بـــانگ ئەکـــەن بـــە ئەســـرینەوە
بـــۆ ســـەر مەیتەکـــەم بـــە گرینـــەوە
لیبـــاسو بـــەرگم لا ئەبـــەن یـــەکجار
تەختەشـــۆر دێـــنن بـــە چـــارو ناچـــار
وەقتـــیَ کـــە شـــۆرام (مـــن بـــە تەمامـــەت)
ئەیکـــەن بـــە بـــەرما بـــەرگی قیامـــەت
مـــەلا ئـــەخوێنیَ نوێـــژ لـــەســـەر مـــەیتم
گشـــت بـــەرێی ئەکـــەن تـــەرمو تـــابوتم
جگـــەر بریـــانم وا بوومـــە قەفـــەس
فریـــام بکـــەوە خـــودای فریـــاد رەس
ســـوار ئـــەبم لەســـەر پشـــتی ئەســـپیدار
چـــوارپێی ئەســـپەکەم ئینســـانی رۆحـــدار
ئەمبـــەن بـــۆ قـــەبران خـــەیلیَ بـــە تـــەعجیل
لـــەویَ دائەنـــێن سەرســـامو زەلیـــل
ئەمخەنـــە قـــەبر بـــە ئـــەڵڵا ئـــەڵڵا

ئایــات ئــەخوێنن لـــە کەلامولئــەڵڵا
مــەلا بـــانگ ئەکــەن تــەلقینم ئــەکا
مــەر خـــوای غــەفوور رەحمـــم پێبکـــا
تەســویەی قــەبرم ئەکــەن بــە هــەمووان
بــەجێم ئــەهێڵن قــەومان و خوێشـــان
(مــەزڵوم)یــش بــە دڵ یــەك رجــا ئــەکا
هــەمووتان بڵــێن خـــوا عــەفووی بکـــا

# نۆ هەواری قەبر

کانی کۆی کەرەم، کانی کۆی کەرەم!
کەریمو غەفوور، کانی کۆی کەرەم
ئومێدم تۆبە خودایی غەففار
لەناو قەبردا بگەی بە هاوار
وەقتێ کە ئەمرین کۆچ ئەکەین لەپڕ
نۆ هەوارینو نۆماڵی قەبر
لەناو قەبردا غەریبو مەهجوور
هیچ کەس نابینین لە نزیكو دوور
خێرا بە ئەمرت یەکتای لامەکان
حازر لەسەرمان مەلەکەی رەحمان
جوابیان ئەدەین بە ئیزنی خوا
فەسیحو بەلیغ سەربەستو وریا
مەعبوودی حەقم یەزدانی تاکە
پێغەمبەری من شاهی لەولاکە
ئیمام قورئان، قیبلەم کەعبەیە
دینم ئیسلامە، ئیمانم هەیە
لێمان رازی بن ئامیرو مەئموور
جێمان جەننەت بێ هەر خۆتی غەفوور
چونکە غەریبم بێ ئەنیسو کەس
کەسی بێکەسان بە فریادم رەس
دوعام قوبوڵکە خالیقی بەشەر
لەبەر خاتری سالاری مەحشەر
دیسان بە خاتر جەمعی ئەنبیا
هەم بۆ خاتری فیرقەی ئەولیا
قوبوڵکە دوعام ئەی (بەحری علوم)
(الهي أنا عبدك المظلوم)

# ڕۆژی خەیاڵ

ڕۆژی خـەیاڵ بـە دڵمـا هـات کـەوا بیسـتە تەمـەن یـاران
بـە چـی مەشـغوڵ بـبم، ئیـتـر چـی بـێ سـەبەبی گـوزەران
لـە دوای گەڵێ فیکـرو خـەیاڵ بـە مەئیوسـی دڵـم دەرکـرد
لەبەر چاوم نەما نەسـرەت کـە مـن ئـەمرم، ئیـتـر بـێ نـان
کـە مـن کەسـبو کـارو ئیشـم لـەبـەر دەسو چـاوم نـەبوو
بـە مـەجبووری بگـرم کەسـێ کـە سـاحێب سـفرەو خـوان
فەقـەت وتم وەهـا چـاکە لـەسـەر فیکـرو خـەیاڵی خـۆم
بـۆ ئـەو شەخسـە مـن بنووسـم نامەیـەکی عەنبـەر ئەفشـان
خـەیالاَتی دڵـم هاتـە وجـودو مـن بـەیانم کـرد
ئەگـەر مـن تـاڵیبی دنیـام، ئـەبێ فیکـرم نـەبێ ئیمـان
ئەگـەر موحتـاجو بـێ نـانم لـە دنیـادا چـییە بـاکم
کـە ئـەم دنیـا فانییـە، وەفـای نییـە لـە بـۆ ئینسـان
شوکر (مـەزڵوم) لـە فـەزڵی خـوا خـەریکی حەمدیـە دائـیم
خەساراتی نییە بـۆ کـەس خسـوس دەرحـەق بـە موسـوڵمان

# پاڕانەوە لە خزمەت پێغەمبەر

ئـەی شـافیعی رۆژی مەحشـەر، دەسـتی مـن‌و دامـانی تـۆ
روو سـیاهو پـڕ گونـاهم دێمـە حـزوور دیـوانی تـۆ
تۆ مـەحبوب‌و هـەم ئەقدەسـی، مـن ئەسـیم‌و شـەرمەزار[1]
غـەرقی بـەحری مەعسـیەتم دەخیلـی تـۆم ئامـانی تـۆ
شـیفای دەردم لـە لای تۆیـە ئـەی رەحمەتـەن للعالـەمین
خـۆت ئـەزانی‌و چارەسـازی دەردی مـن‌و دەرمـانی تـۆ
نییـە شـیفای دڵـی زارم روو سـیاهو بـێ قـەرارم
مەگەر بـۆ خـۆت بکـەی چـارم یـا پادشـای گـەیلانی تـۆ
دڵ حـەزینم هـەر وەکـو نـەی بـۆ فیرقـەت ئـەناڵێنێ
ئینتـزاری لوتفـت ئەکـەم، عاشـقی تـۆم حـەیرانی تـۆ
مـن عاشـق‌و حـەیرانی تـۆم ئـەی سـەیدی مـەولای مـن
دەرکـراوو دەربـەدەرم لەسـەر خـوان‌و ئـەیوانی تـۆ
لـە دیـوانی ئیتاعـەتا (مـەزڵوم) کـوێری بـێ گۆچـانە
رێنمـاو عەسـای دەسـتم لـوتفی تۆیـەو ئیحسـانی تـۆ

[1] ئەسیم: واتە خەمبارم.

# سکاڵا لە خزمەت خوادا

رەببــی تــۆ بۆچــی منــت ریســوا کــرد
لــە موڵــكو میللــەت منــت جیــا کــرد
بۆچـــی بـــە جـــاریَ کەســـیفت کـــردم
لـــە فـــەیزو رەحمـــت موفلیســـت کـــردم
تانـــەی ئـــەغیار کـــەوتووە بـــە بـــار
بـــە دڵـــی حـــەزین لێـــت ئەکـــەم هـــاوار
شـــیفای دەردم لای تـــۆ مـــەوجودە
لـــە دنیـــاو ئـــاخر هـــەرتۆم مەقســـودە
بـــەحری کـــەرەمت بـــۆ نایەتـــە جـــۆش
زەرەیـــەك بەخشـــی بـــە منـــی بێهـــۆش
گەرچـــی مـــن عاســـیو خەجاڵـــەت بـــارم
روو زەردو مـــەحجوب زۆر شـــەرمەزارم
لـــە مـــوڵکی تـــۆدام هـــەر لـــەویَ ئـــەمرم
بـــە رووی رەشـــەوە دیوانـــت ئـــەگرم
غـــەرقی عســـیانم دێمـــە حـــزوورت
بـــۆ تاوانبـــارە ئیســـمی غـــەفوورت
خوایـــە بـــە جـــاهی شـــای بـــوراق ســـوار
خۆشـــبە لـــە جـــورمی (مـــەزڵوم)ی هـــەژار

# بۆ بەرزنجە

دیسـان ئەلسـەلام ئـەی کۆگـای گەوهـەر
جێـی ئـەولیاو شـێخ، خـەتیبی مینبـەر
مـن بـۆ حـالّی تـۆ شـێواوە حـالّم
بـۆ دزو جـەردە: بـۆ بـووی بـە سـێبەر
ئـادەمو پـەری، عەشـایر هـەموو
بـۆ ئیتاعـەتت بەسـتبووی کەمـەر
خاکـت گەوهـەر بـوو، غوبـارت جەوهـەر
چەندە شـەریف بـووی لای خـواو پێغەمبـەر
ئێسـتاکە بۆچـی کـزو دامـاوی
هـەروا زەلیـلو خـوارو موحەقـەر
زەمـان رووی رەشـبێ بـۆ دەورو چـەرخی
کـردی پامـالّی ئـەولادی حەیـدەر
مـن کـە ئەسـیمو پـیسو بـەدکارم[1]
دوعـام ئەمەیـە قـەومو بـرادەر:
بـە (مـەزلوم) بلّـێن بۆچـی شـێواوی
لـە داغـی عالـەم، چـەرخی دوون پـەروەر

---

[1] ئەسیم: خەمبار.

# سکاڵا لەگەڵ پێغەمبەر

پێغەمبـــەر بـــە نـــاو مـــن ئـــەولادی تـــۆم
وەچـــەی عـــەلیمو ئەســـڵ زادی تـــۆم
دیســـان لـــە نەســـلی فاتیمـــەی زەهـــرام
تـــۆ (بـــاپیرمی) بـــە مـــەعلومی عـــام
ئـــەمن هەرچـــەندە ســـپڵەو بـــەدکارم
غـــەرقی عیســـیانم خەجاڵـــەتبارم
عالـــەم ئـــەزانێ تـــۆ بـــاوانمی
ســـەگی رووســـیام تـــۆ خـــاوانمی
لـــە دنیـــا هەرکـــەس هـــەیبێ خاوەنـــێ
نـــەجاتی ئـــەدا لـــە گشـــت تاوانـــێ
لـــە تـــۆ زیـــاتر هـــیچ کەســـم نییـــە
کـــە تـــۆ کەســـم بـــی، کەســـم بۆچـــییە
تـــۆش لـــە لای خـــودا زۆر موقەدەســـی
بـــۆ گوناهکـــاران تـــۆ فریـــاد رەســـی
قورئـــانی کـــەریم هەدیـــەی بـــۆ تۆیـــە
ســـەفەری میعـــراج دەعـــوەتی تۆیـــە
ئەمانـــە هـــەموو بـــە ئـــەمری مـــەعبود
بـــۆ خـــاتری تۆیـــە هاتوونـــە وجـــود
تـــۆش بـــۆ خـــاتری یـــەکتای لامـــەکان
هـــەم بـــۆ خـــاتری ئایـــاتی قورئـــان
ئـــەو رۆژە خـــودا ئەبێتـــە حـــاکم

جــــەنابت قـــازی شــــەفیعو عـــالم
دەفتــەری جــورمم کــە هاتــە دیــوان[1]
قەڵــەمی عــەفوو بــدە لـــە عسـیان
زۆر خەجاڵـــــەتم کــــۆڵم عســـــیانە
پیشـــەی (مـــەزڵوم)یــش وەك زاڵمانــە

[1] جورم: گوناه.

# پاڕانەوە لە خزمەت خوادا

خودا بێزارم لە قەلبی حەزین
بێزارم لە خۆم، ئەحواڵو نگین
لە بەختی شوومو نەحسم تەوەللام
کە ئیقباڵو تەجەلیشم لێم بێبەرین
ئەمەندە باری میحنەت بۆتە بارم
قەدم عەینەن، بوو بە چۆگانی چەمین
لەبەر عسیان، دڵم رەشو قەلبم رەشو رووم رەش
(لە روو رەشم نانوێنێ رەشو شین)
لەبەحری قەسوەتا غەرقە گیانم
نەجاتم زەحمەتە بۆ جێگای ئامین
مەزرەعەی تاعەتم وا وشکە تەواو
سەراسەر زەرد بووە وەك پووشی هاوین
لە دڵدا ئاتەشێکی دەردی عیسیان
کڵپەی سەندووە، بڵێسەی بەتین
ئەمەندە عاسیو خەجاڵەتبارم
خوداو پێغەمبەرم لە من ناڕازین
لە دنیا ئەمەندە عاسیو یەتیمم
هەموو عالەم لە من تەبەڕاو بەرین
خودایە بەم هەموو گوناهەوە چۆن:
ئەبێ بێمە دیوانت رۆژی دوایین
منو نەفسم چۆن لە رووی تۆو حەبیبتا
ئەتوانین چاوی خەجاڵەت هەڵبڕین
زوبانم چۆن ئەتوانێ بێتە گوفتار
کە نەیبوو لە دنیا زیکری یا موعین
ئیلاهی بە جاهی حەبیبەکەی خۆت
ببورە لە جورمو خەتای (مەزڵوم)ین

## کزەڵ و مەزڵوم پێکەوە ئەم چوارینەیان داناوە

کزەڵ:

به بیری خۆم وەهام نیاز بوو سکەی رەواجی دیـن لـێـدەم
که لـێمدا بێ رەواج دەرچوو، فەلـەك وا عەکـســی هێنـاوە

مەزڵوم:

لــە هــەر لایــەك هــەبێ ئیمــڕۆ ئــەدیب و عــالم و زانــا
ئەویش وەك تۆ بە مەعلومی لە گەل هــەروا بــەجێماوە



بــۆ دەفعــی ژارو ژەنگــی جگــەرە
بنێــرە بــۆ مــن دوو دارجگــەرە[1]



### فەرد

لە ناو جاخێکـا وەك گـونی بـەران
کیلۆیــەك زیــاتر نــەبوو بێگومــان[2]

---

[1] ئەم تاکە بەیتەی ناردووە بۆ (شێخ جەعفەری شێخ حسێن) کە داوای دارجگەرەی لێکردووە.

[2] شاعیر ئـەو بەیتـەی نـاردووە بـۆ مامۆسـتا (شـێخ جەعفـەری شـێخ حسێن) کـە لـە پێشـدا داوای تووتنی لێکردووە.

# سوپاس

سوپاسی بەڕێزان مامۆستا (مەلا مەحموودی کزەڵ)و مامۆستا (حسن نێرگسەجاڕی) دەکەم کە هەندێ تێبینیو چەند وشەیەکیان بۆ راستکردمەوە..
سوپاس بۆ مامۆستا یاسین کە خاڵۆزای شاعیرەو دەستی باڵای هەبووە پاراستنی ئەم دیوانە بۆ جاری دووەم.

**شێخ عمر سید أحمد**
**کوڕی مەزڵوم**

**لە بەرهەمە چاپکراوەکانی مامۆستا ئومێد کاکەڕەش:**

١) دیوانی عارف عورفی/ ساڵی ١٩٨٥.
٢) دیوانی حیلمی/ ساڵی ١٩٨٥.
٣) دیوانی سەلام/ ساڵی ١٩٩١.
٤) دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی/ ساڵی ١٩٩٩.
٥) دەنگی چەند شاعیرێك، لێکۆڵینەوە/ ساڵی ٢٠٠١.
٦) دیوانی مەزلوم/ ساڵی ٢٠٠٣.

**ئەو بەرهەمانەی بەدەستەوەن بۆ چاپ:**

١) هۆنراوەی سەرەکیی گلکۆی ئازیزان.
٢) جوولەکەی کۆلگێڕی شێخ سەلام.
٣) دیوانی ئیبراهیم ئەحمەد.
٤) شیعرو ئەدەبیاتی کوردی.
٥) دەنگی چەند شاعیرێك، بەرگی دووەم.

## زنجیرەی چاپکراوەکانیساڵی ٢٠٠٥ی
## بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی رۆشنبیری

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێر | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٢٠١ | بەشداری کردنی پەروەردە | عەبدولعەزیز عومەر | پەروەردەیی | چاپکردن |
| ٢٠٢ | پیاسەیەك بەکووچەکانی قەدەردا | ئاوێزان نوری | شیعر | چاپکردن |
| ٢٠٣ | گۆڤاری تێکست ژمارە (٥) | چاپوبڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٢٠٤ | دەنگی بلورینی دەق | عەبدولخالق یەعقوبی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٢٠٥ | رۆناك | جگەرخوێن | شیعر | چاپکردن |
| ٢٠٦ | بۆ زمان | د.عیزەدین مستەفا | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٢٠٧ | دوورگەی بێداری | تەها ئەحمەد رەسوڵ | شانۆگەریی | چاپکردن |
| ٢٠٨ | داستانی خەباتو ماڵئاوایی | شێخ حسێنە سوورە | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٢٠٩ | ماچی گوڵشەنو کانیاوەکانی کوردی | ئەحمەد هیرانی | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٢١٠ | شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ | عەبدولقادر ساڵح | رامیاری | چاپکردن |
| ٢١١ | کورد لەچەند تۆمارێکی مێژووییدا | کەیوان ئازاد ئەنوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٢١٢ | فەرهەنگی کورد ناسین | مەلا عەبدولخالق شوانی | فەرهەنگ | چاپکردن |
| ٢١٣ | شیخ محمد خال مفسرا | عمر علی محمد | ماجستێرنامە | چاپکردن |